

# وشەی پرشنگدار

**بە بێ خۆ بەستنەوەو بە بێ دوو دڵیو بە بێ ترس بنووسن ئەگەرچی دەوڵەت رازی بێت یان رازی نەبێت لەوەی دەینووسن...**

**سەرۆکی فەرمانده**
**صدام حسین**

# لەم ژمارەیەدا

# بەیان

کۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبییە



ناونیشان

دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی
وەزیریە ئەمیشت . المعهد الفضائی
ت ٤٢٥١٨٤٦ پینج خەتە

بەیان

بەرگی یەکەم [illegible]ەری شاعیر

ئابوونەی سالانە لە ناو عیراقدا ٠ ٠ ١٠/٠٠ . دینارد

تکایە هەر نووسەرێك خەتەکەی خوش و شاش و جوان نەبێ نووسینەکەی دەخرێتە پشت گوێ


نرخی «٤٠٠» فلسە

بەیان ژمارە ١٦١و١٦٢ی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی سالی
١٩٨٩، ١٤١٠ کۆچی

# سوپای پاڵەوان



ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی سوپامان داکارێکی ئاسایی و وەکو سوننەتی پێشوونی بەڵام جیاوازییەکی گەورە لەگەڵ ساڵانی ڕابوردوودا هەیە، ساڵانی ڕابوردوو بەم بۆنەیەوە جەژنی خۆمان دەگێڕا و سوپاکەمان لە هەموو بەرەکانی جەنگدا لە گەرمەی شەڕدا بوون، سوپاکە خۆیشی هەر لەوکاتە و ستانەدا و لە سەرسنوری وڵاتەکەمان دا کە بەرانبەر بە سوپای ئێران ڕاوەستا بوو ئاهەنگی خۆی دەگێڕا و پڕۆگرامی ئاهەنگی پێش کەش دەکرد، ئەمە لە بچوکترین شانەو ڕەهەندەکاندا تا دەگەیتە گەورەترین بەشەکان وەکو لیوا و تیپ و فەیلەق. وەکو ووتمان ئەمە لەکاتی گەرمەی شەڕەکەدا بوو و هێشتا بە تەواوەتی سەرکەوتنەکەمان کۆتایی نەهاتبوو. بەڵام ئەو ئەمساڵ سوپای دلێرمان بە سەرۆکایەتی قارەمان صدام حسین خۆبەخت دەبینێت، تونی بە تەواوەتی سەرکەوتنی خۆی وەدی بهێنێت و ئاشتی بەسەر مەڵاکاندا بسەپێنی. سوپای قادسیە گەورەترین سەرکەوتنی وەدی هێنا ئەمەش لە شەڕێکی دوورودرێژدا کە ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەقی کێشا و دوژمنی درندەش بە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر هێرشی دەهێنا و دلێرانی قادسیە بە ژمارەیەکی زۆر کەم بەرەنگاریان دەکردو هەر جارەش بە شێوەو جۆرێک

وەڵامی هەڵمەت و هێرشەکانیان دەدایەوەو لە دوایی دا ئێرانییەکان بەسەرشۆڕی و ناهومێدی ڕایان دەکردو هەمەدەهاتن ئەمەش دوای زیانێکی ئێجگار زۆر لە کوشتار و کەرەسەکانی جەنگ و زیانی دارایی و هتد.. ئەمەو گەلانی سەرزەمین بەش دەزانن تا چ ڕادەیەک دەستەو دیەرەی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم دەستی یارمەتی بۆ ئێرانییەکان درێژ دەکرد و چەک و پسپۆڕییان دەدانێ و لەگەڵیان ئیریان دەکردن. بەڵام هێشتا هەر بێ سوود و بێ هودە بوو، چونکە سوپایەک لەڕێی ئەسەرچی و ڕێچی دەجەنگی ئیتر چۆن دەتوانی بەرانبەر بە سوپایەک ڕاوەستێ کە بە تەواوەتی لای ئاشکرا بووە کە شەڕەکەی لە پێناوی پاراستنی خاکی نیشتمانێ و بەرەنگاری هەموو هەوڵێکی لای ئاشکرا و دیارە کە دوژمنی ئێرانی دەیەوێ خاکەکەی داگیر بکات و دەسەڵاتی خۆی بەسەردا بسەپێنی. کەوابێ بێجگە لە

سەرکردایەتی یەکێ دانەواز و سوپایەکی قارەمان لایەی مەعنەوی جێگای دیاری خۆی هەیە لە شەڕو جەنگدا و دەوری خۆی لە سەرکەوتن دا دەبینی. گەلی عیراق و سەرکردایەتی عیراق ئەوپەڕی ڕێزی لە دراوسێ و گەلانی تر دەگری و قازانجی ئەوان و مافیان وەکو قازانج و مافی خۆی رەچاو دەکات، بەڵام مەلاو ئاخوندەکان بەپێچەوانەوە بە چاوێکی پڕ لە تەماعەوە سەیری سامان و دارایی خەڵک دەکەن، ئەمەش هەرگیز لەگەڵ ڕێبەوی مرۆڤایەتی و مافی کۆمەڵ وگەلان دا ناگونجی، بگرە ئاکار و ڕەوشتی چەتەگەریی و دزی و جەردەیی سەدان ساڵە کۆمەڵ بەجێی هێشتووە و نیستە لە ژیانێکی تری چەرخی بیستەم دا دەژین کە هەرگیز بوار نییە ئەدری ڕەفتاری وابکری و بەڵکو دەبێتە مایەی شورەیی و شەرمەزاری بۆیان، ئەمەیە ڕەفتاری مەلاو ئاخوندەکانی تاران...

ئەنجامی ڕەفتارەکانیانیش دەرکەوت ئەوە بوو لە شەڕە خوێناوییەکانیان دا کە بەسەر عیراق دا سەپاندیان دوڕاندیان و سەرشۆڕ و ناهومێد بوون... ئاڵای شەکاوەی عیراقیش هەر بە بەرزیی خۆی مایەوە. کەوابێ جەژنی سوپای ئەمساڵمان جەژنێکی مەزن و گەورەو پیرۆزە چونکە سوپاکەمان بە سەرکەوتن کۆتایی بە جەنگەکەی هێناو ئاشتی ی بەسەر سوپای ئێران دا سەپاند... ئەویش لە ژێر ئاڵای قارەمان صدام حسین دا.

● نەریمان حسین کریم ●



# "٦"ی کانوونی دووەم ڕۆژێکی پرشنگداری مێژووی عیراقە

● دلشاد آیوب سعید ●

ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەم. . ئەو ڕۆژە پرشنگدارەیە لە مێژووی گەلی عیراق و نەتەوەی عەرەب دا کە هەموودەم پرشنگی ڕووناکی بۆ هەموو بوارەکانی نیشتمان و نیشتمانی گەورەی عەرەب ئەوەشێنێت و هیواو ئاوات و خۆشەویستی گەورەتر و مەزنتر دەکات هەر ئەم سوپایە بوو کە لەگەڵ هاوڕێیانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست توانییان لە بەرەبەیانی ١٧ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٦٨دا شۆڕشی مەزنی تەممووز بەرپابکەن و شۆڕشێکی سپی بۆ گەل و بۆ عیراقی خۆشەویست بهێننە کایەوە. . . لەم ڕوانگەوە ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەم بووەتە ڕۆژی وەرچەرخانی نوێ لە مێژووی گەلی عیراق و نەتەوەی عەرەب دا کە لەو ڕۆژە پیرۆزەدا سوپا بوو بە ڕەمزی سەرکەوتن و بەرەوپێشەوە چوون بۆ گەل و نیشتمان و نەتەوە. . . هەروەها بە تیشکی ڕووناکی تاریکی چەند ساڵەی پێشووی بەزاند. . .

ئەم ڕۆڵە نەبەزانەش هەمیشە وەکو شێر بەربەرەکانیان دەکرد لەگەڵ داگیرکەراندا و بە هەزاران ڕۆڵەی قارەمانیان خوێیان بەخت کرد لە پێناوی ئامانجەکانی حزب و گەل دا.

حزبی بەعس. . . حزبی جەماوەری عەرەبی سۆشیالیست ئەو حزبەی کە ناسراوە بە ئازایەتی و دلێری و کۆڵ نەدان، ئەو حزبە هەر لە یەکەمین ڕۆژی دامەزراندنیەوە دەستی کرد بە خەبات و تێکۆشانێکی بێ ووچان لە پێناوی سەربەخۆیی و ڕزگاری خاك و نەتەوەی عەرەب داو دەیان جار هەڵساوە بە خۆپیشاندان و شۆڕش هەڵگیرساندن دژی داگیرکەران سوپاکەشمان بە بیری دانایی و لێهاتوویی سەرکردەی عیراق و عیراقییەکان لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی تریان دەبات هەر لە جەنگی دژ بە کۆمپانیە ئیمپریالیزمەکان و جەنگی دژ بە بیگانەو، خۆماڵی کردنی نەوت و بنیاتنان و پەرەپێدان و بگرە تا جەنگی قادسیەی صدام، کە لەم جەنگەدا ئەم سوپایە ئەوەی سەلماند کە نەك هەر توانی ئەوەی هەیە کە دژ ئێرانە بجەنگێت و سەرکەوتن و ئاشتی بەدی بهێنێت، بەڵکو توانای گەورەتری لەوەدا هەیە کە هەموو سەردەمێك و هەردەم ئامادەیە بۆ ئەوەی هیواو ئاواتی دوژمنان و ناحەزان لە ناو بەریت و ئاڵای سەرکەوتن بلند بکاتەوە بۆ هەموو جیهانیش ئەوە ئاشکرا بکات کە عیراق هەر سەرکەوتووە. . چونکە سەرکردەی داناوو هۆشیارو ئازای خۆی هەیە، کە قارەمانی شۆڕشی ١٧ - ٣٠ی تەممووزی پیرۆزی نەمرە. . . کە بە گەورەترین داستان لە مێژووی گەلی عیراق دا دەژمێردرێت. لەبەر ئەمە هەر لەو کاتەدا جەماوەری حزب و ئەندامانی کە زۆر بڕوایان پێ بوو چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە ڕزگاریان بکات و دەستیان بگرێت بەرەو ڕزگاری و سەرفرازی و ژیانێکی پڕ لە کامەرانی و سەربەستی بۆیان بخولقێنێت. بەم شێوەیە سوپاکەمان بە بۆنەی ڕۆژی لە دایك بوونی مۆمێکی تر دادەگیرسێنێت و ئەوەمان بۆ دوو پات دەکاتەوە کە سوپایەکی بە سۆز و بە جەرگەو بە وەفایەو ئەمکدارە بۆ گەل و خاك و نیشتمان و سەرکردەکەی کاکە صدام حسین کە ئەم سوپایە هەمیشە قەڵغانێکی پۆلایین بووەو سەرکوتی دوژمنانی گەلەکەمانی کردووەو بە بەردەوامی سەرکەوتوو بووە چونکە ئەم سوپایە بە بڕواوە دەجەنگی و خۆی بە سوپای عیراقی داناوە.

هەموومانیش لە باو باپیرانمان بیستووە کەوا چۆن سوپاکەمان شان بەشانی براکانی عەرەب جەنگوون دژی داگیرکەرانی زایۆنی لەکاتی داگیرکردنی خاکی فەلەستین.

هەروەها سوپای قارەمان هەرگیز کۆڵی نەداوە لە تێکۆشان و شۆڕشی دژی ئینگلیزە داگیرکەرەکان و کۆنەپەرستان و بە خوێنی گەش و ئاڵی خاکی نیشتمانی ئاو دەداو ئاڵ دەکرد.

سلاو لە هەموو سەربازە دلێرەکانمان دەکەین.

چەپکە گوڵێکی ڕازاوەش بۆ تۆ ئەی سەربازی بە جەرگی عیراقی.



# دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاوکاری عەرەب و پێک هێنانی بازاری هاوبەش

دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاوکاری عەرەب لە رێی زنجیرەیەك کۆبونەوەدا خەریکی پێك هێنانی چەند یاساو بریارو پرۆژەی هاوبەشن لەنێوان ئەو چوار دەوڵەتەدا.. لە بەغدا وبۆ ئەم مەبەستە چەندە کونگرەی وەزیرانی پیشە سازیو دارایی‌و پەروەردەو زانیاری‌و راگەیاندن و رەوشەنبیری ساز کرا... گومان لەوەشدا نی‌یە کە ئەم لژنانە پێش بەستنی کونگرەی بەرزی داهاتوو لە (صنعاء) چەندین کاروباری هەمە جۆر لەم مەیدانەدا تەواو ئەکا.. کە سەرەتاکەی بازاری هاوبەشی ئەنجومەتی هاوکاری عەرەبە..

ژمارەیەك لە پرسراوانی ئەم چوار دەوڵەتە وتویانە توانای دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاوکاری عەرەب گەلێك زۆرە، ئەمەش وای لێ ئەکا بازارێکی هاوبەشی تایبەتی بۆ خۆی هەبێ خزمەتی هەموو لایەك بکا دیسان لەم ولاتانەدا کارکەران گەلێك زۆرن کە ژمارەیان ئەگاتە (٢٢) ملێون کرێکار.. جا بیرکردنەوە لە پێك هێنانی ئەم جۆرە بازارە خزمەتێکی گرنگە بۆ ئەو چواردەوڵەتەو هەروەها بۆ گەشە پێدانی باری ئابووری‌و لایەنەکانی تری ژیان. مەیدانی دارایی‌و چۆنیەتی بەکار هێنانی سامانی ئەم چوار وڵاتە بۆ خزمەتی گەل و نەتەوەو مەیدانی ئابووریش کەمترنی‌یە لە کەرتەکانی تری ژیان چونکە کار ئەکاتە سەر بناغە دانان و پێش کەوتنی ئەو وڵاتە.. خۆ گەر تەماشایەکی لایەنی پەروەردەو خوێندنی باڵا بکەین لەم چوار وڵاتەدا ئەوا بەراست و رەوانی ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە چەندەها ئامانجی هاوبەش لە نێوان ئەم دەوڵەتانەدا هەیە..

مەیدانی رۆشنبیری‌و راگەیاندنیش دەوری گرنگ و بەهتووی خۆی بینیوە لەمەیدانی رێك خستنی کاروبارو هاوکاری دووقۆڵی تەنانەت پێش ئاشکراکردنی ئەنجومەن. ئیستاش بینەری تەلەفزیۆن بە چاوی خۆی ئەو نامانە ئەبینێ کە ئەگۆردرێتە وە لە نێوان وڵاتانی عەرەبداو هەموو هەفتەیەك..

کە دوور نی‌یە ئەم کارەش ببێتە هۆی پێك هێنانی نۆژانسێکی هاوبەش بۆ دەنگوباسەکان.. بەم جۆرە وە لەماوەی رۆژەکانی رابوردوودا چەندین کۆبرونەوەو بە پلەی وەزیران لەبەغدا بەسترا بە ئەمانجی رێك کەوتن لەسەر هەندێ خاڵی هاوبەش دەربارەی هاوکاری‌و پەیوەندی نێوان ئەم چوار دەوڵەتە.. کە هیوا ئەخوازرێ لە پاشە رۆژدا دەوری گرنگی ببینێ لە پێش خستنی گەل و نیشتمان و نەتەوەی عەرەب بەگشتی.

● شیرین ●

# ڕاستکردنەوەی هەڵبەست

● کەریم مستەفا شارەزا ●

لە ژمارە [١١٨]ی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێی مانگی حوزەیرانی ١٩٨٨دا، لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی ی کاك [ئومێد ئاشنا]م بە ناونیشانی [چەند لاپەرەیەکی نوێ سەبارەت بە بەرهەمەکانی هەردوو مستەفا شەوقی]م خوێندەوە. نووسەر چەند لاپەرەیەکی نوێی لەبارەی ئەو دوو نووسەر و شاعیرو نیشتمان پەروەرە کوردانە بڵاوکردوتەوەو، کارێکی باشی ئەنجام داوە.

بەڵام ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەی بوو، کە لە لاپەرە [١١٩]دا نووسراوەو، بە ناونیشانی [ڕاست کردنەوەی هەڵەیەك] پێشکەش کراوە، کاك ئومێد لە ڕاست کردنەوەکەیدا نووسیویەتی و دەڵێ: - [ئەو کوردە مەزن و دڵسۆزانەی کاك - مومتاز حەیدەری - لە ساغ کردنەوەو چاپ کردنەوەی گۆڤاری [پەیژە]ی مستەفا شەوقی ی خەڵکی سلێمانی دا . . . هەڵەیەك هەیە، کە نە مستەفا شەوقی خۆی و نە کاك مومتاز، وە هیچ کام لە نووسەران هەستیان پێ نەکردووە، ئەویش ئەوەیە لە لاپەرە [١٣٦، ١٣٧]ی کتێبەکەدا [واتە: مستەفا شەوقی و پەیژە . . . ك. م. ش.] شیعرێك هەیە بە ناوی [وەسیەت]، لە پێرستی گۆڤارەکەدا لە لاپەرە [١٤١]دا نووسراوە «وەسییەت، شیعر: سید عبدالخالق کەرکووکی»

واتە: ئەسیری شاعیری کەرکووکی][١].

ئینجا کاك ئومێد دوای ئەم بەهەڵەزانینەی وەپاڵدانی ئەو هۆنراوە ناوداراوەی [وەسییەت] بە شاعیری نەتەوەیی کورد [عەبدولخالیق ئەسیری] لەسەر بڕیارەکەی خۆی دەڕوات و دەڵێ: -

[بەڵام ئێمە بە چەند بەڵگەیەك ڕوونی دەکەینەوە کە ئەوە شیعری - مامەند کەرکووکی - واتە: [ڕەمزی ڕەحیم]ی کەرکووکی یە، کە یەکێك بووە لەو شاعیرانەی لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیی ساڵەکانی بیست دا دەستێکی باڵای هەبوو][٢].

لێکۆڵەرەوە کە ناوی مامەند کەرکووکی دەبات، لە پەراوێزدا دەست بۆ سێ نووسینی من درێژ دەکات کە لە ژمارەکانی [١٧، ١٨، ٢٣]ی گۆڤاری [بەیان]دا لەسەر [مامەند کەرکووکی]م نووسیوەو گەشتی ژیانی و شاعیریەتی و هەندێ لە نموونەی شیعرەکانیم بڵاوکردوتەوە.

هەرچەندە من بەشداریم لە ساغ کردنەوەی ژیان و بەرهەمەکانی هیچ کامێك لەو دوو مستەفا شەوقی یە نەکردووە، بەڵام بەو بۆنەیەی کە یەکێکم لەو نووسەرانەی بە وردی و بە دوورو درێژی لەسەر ژیان و شیعرەکانی [ئەسیری: ئاثیری]، [مامەند کەرکووکی]م نووسیوەو جگە لە نووسینی چەندین وتارو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە سەریان، یەکێکم لە دانەرانی کتێبێك لەسەر ئەسیری و ابوو لە ساڵی ١٩٧٤دا بە هاوکاری کردن لەگەڵ برادەرێك دا بە ناونیشانی ئەسیری شاعیرێکی شۆڕشگێری قۆناخی دوای حاجی قادری کۆیی یە] بە چاپ گەیاندو بڵاوکردەوەو شیعرەکەی [وەسییەت]ی [ئەسیری] مان لەناودا چەسپاند، چونکە لە شیعرە ناودارو سەرکەوتووەکانی یەتی[٣]، بۆیە ئێستا بۆم هەیە خۆم بە یەکێکی پەیوەندیدار بە شیعر و شاعیری یەتی هەردوو شاعیری کەرکووکی [ئەسیری] و [مامەند] دابنێم و بڕیارو ڕایێکی ڕوون و ڕەوان لە بارەی خاوەنی ڕاستەقینەی هۆنراوەکەی [وەسیەت] بدەم.

بۆیە بە وردی لە بەڵگەکانی کاك ئومێد ئاشنا دەکۆڵمەوە تاکو

بزانم چۆن وا قەناعەتی هاتووە کە بە دڵنیایی یەوە بڵێ : هۆنراوەکەی «وەسیەت» لە شیعری مامەند کەرکووکی یە؟!

**بەڵگەی یەکەمی :**

---

کاك ئومێد دەڵێ : [مستەفا شەوقی کە لە ساڵی ١٩٢٧دا گۆڤاری [پەیژە] ی چاپ کردو بڵاوی کردەوە، ئەوشیعرو نووسینانەی بە دەستی لە خاوەنەکانیان وەرنەگرتووە، بەڵکوو لە گۆڤارو ڕۆژنامەوە وەری گرتوون کە پێش ساڵی ١٩٢٧ بڵاوکرابوونەوە].

ئینجا لێکۆڵەرەوە چەند نموونەیەك لە شیعرو نووسینی شاعیرو نووسەرانی کورد دێنێتەوە، کە لە گۆڤاری [پەیژە]دا بڵاوکراونەتەوەو لەوەوبەر لە گۆڤاری تردا نووسراون، وەکو گۆڤاری [بانگی کوردستان]ی ساڵی ١٩٢٦.

● لە وەڵام دانەوەی ئەم بڕیارو ڕایەی کاك [ئاشنا]دا دەڵێم : ـ

ئەم بەڵگەیەت ئەوە ناگەیێنێ کە خاوەنی گۆڤاری [پەیژە] بەو هەموو هۆشیاریی نەتەوەیی و ڕۆشنبیری یەوە، ئەگەر بابەتی لە گۆڤاری تریش وەرگرتبێ، بچێ هۆنراوەیەکی بەرزو ناوداری وەکو «وەصیەت» وەك کاك ئومێد دەڵێ لە جیاتی بە ناوی [مامەند کەرکووکی] بڵاوبکاتەوە، بیداتە پاڵ ناوی [سەید عەبدولخالیقی کەرکوکی] واتە : [ئەسیری]!!

چونکە [مستەفا شەوقی ڕەمەزان]ی ئەدیب و ڕۆژنامە نووس ئەوەندە ئاگاداری شاعیرو شیعرو نازناوی شاعیران بووە، نەچێ بە هەڵە بەرهەمی یەکێکیان بداتە پاڵ یەکێکی دیکەیان، بەتایبەتی بەرهەمی شاعیری ناسراوو گەورە بەڵگەیێکی لەمەش بەهێزتر ئەوەیە [ئەسیری]و [مامەند] هەردووکیان ڕۆڵەی شاری کەرکووك بوون و نزیکی [مستەفا شەوقی] بوون و دەنگیان گەیشتووەتی و، ئەگەر بە هەڵە ئەمەی کردبایە، ئەوا بێ گومان [مامەند کەرکووکی] لە ڕۆژنامەی وەکو [ژیان] [١٩٢٦ ـ ١٩٣٨] یاخود گۆڤاری زاری کرمانجی [١٩٢٦ ـ ١٩٣٢] کە [مامەند] لە یەکەم ژمارەوە شیعری تێدا بڵاوکردۆتەوە، [ڕوون کردنەوەیەکی] بڵاودەکردەوەو دەیگوت ئەم هۆنراوەیەی [وەسیە] شیعری منەو بە هەڵە لە [پەیژە]دا دراوەتە پاڵ [ئەسیری]!! یاخود [ئەسیری] دەیگوت هی من نی یە. کەچی ئەمە لەسەر ڕووی هیچ [ڕۆژنامەو گۆڤارێکی کوردی]ی ساڵی ١٩٢٧و دوای ئەو ساڵە، واتە : [دوای دەرچوونی پەیژە] بەرچاوی خوێنەران نەکەوت!!

کەچی لە کاتێك دا کە هۆنراوەکەی سنوور]ی ئەسیری بە هەڵە درابە پاڵ [حاجی قادری کۆیی]و، لە پەراوێزی لاپەرە [٥٨٧]ی چاپە فارسی یەکەی [شەرەفنامە] نووسرا کە لە قاهیرە بڵاوکرایەوە. زۆری پێ نەچوو [ئەسیری] لە گۆڤاری [هاوار]ی ژمارە [١٠]ی ساڵی [١]ی ڕێکەوتی ٢٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٢دا هۆنراوەکەی بە تەواوی بڵاوکردەوەو هەڵەی پەراوێزەکەی شەرەفنامەی ڕاست کردەوە(٤).

**بەڵگەی دووەمی کاك ئومێد ئەمەیەو دەڵێ :**

---

[ئەم شیعرەی وەسیەت لە ژمارە [٤٤]ی ساڵی ١٩٢٥ی ڕۆژنامەی [ژیانەوە]دا بڵاوکراوەتەوە، لەگەڵ دوو شیعری دیکەدا لە ژمارەکانی [٤٣، ٤٤]ی هەمان ڕۆژنامەو هەمان ساڵ دا، هەر سێکیان بە ئیمزای [کەرکووکی] واتە : [مامەند کەرکووکی : ڕەمزی ڕەحیم] بڵاوکراوەتەوە. بەڵام دوایی واتە لە [ساڵی ١٩٢٧] ەوە بە ئیمزای [مامەند کەرکووکی] شیعری بڵاودەکردەوە، هەتا لەگەڵ شیعرەکانی [ئەسیری]دا تێکەڵ نەبن کە ئەویش بە ئیمزای [کەرکووکی] یەوە دەکردنەوە!!].

لە وەڵام دا دەڵێم : کاکە ئاشنا ئەگەر تۆش هاتویتە سەر ئەو ڕایەی کە [ئەسری] بە نازناوی [کەرکووکی] شیعری بڵاوکردۆتەوە، کەواتە : ئەو هۆنراوەیەی [وەسیەت] کە لە ژمارە [٤٤] ی ڕۆژنامەی [ژیانەوە]ی ساڵی ١٩٢٥دا بڵاوکراوەتەوەو ناوی [کەرکووکی] بەسەرەوەیە بۆ هی [ئەسیری] نەبێ و، لەو هەموو کێشەو بینەوبەرەیە ڕزگاریمان نەبێ؟! هەر لەبەر ئەوەی، وەك لە بەڵگەی چوارەمت دا دەڵێی لەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی [ژیانەوە] دا کە لە کتێبخانەی گشتی ی سلێمانی دەست دەکەوێ یەکێك بە قەڵەمێکی ڕەش لە تەنیش چاپی ناوی کەرکووکی نووسیویەتی [مامەند]؟! بۆ دەبێ ئەو خوێندەوارەی کە ئەمەی نووسیوە لە [مستەفا شەوقی]ی خاوەنی [پەیژە] هۆشیارترو ئاگادارتری شیعرو ئەدەبیاتی کوردی بێ؟!

لێرەدا دەمەوێ ئەو ڕاستی یە ساغ بکەمەوە کە [سەید عەبدولخالیقی کەرکووکی] بەر لەوەی نازناوی [ئەسیری : أثیری] بۆ خۆی هەڵبژێرێ، بە ئیمزای کەرکووکی ]یا [عەبدولخالیق کەرکووکی] شیعری بڵاوکردۆتەوەو کاك

[ئـاشنـا]ش لەمـەوبـەر پێ ی لەوراستـی یـە ناوگوتی : [ئـەسیـری]یش بە ناوی [کەرکوکی] شیعری بڵاوکردۆتەوە، بەڵگەی منیش ئەمانەی خوارەوەن : ـ

١ ـ رەمزی رەحیم جاوفرۆش کە نازناوی [مامەند کەرکوکی] بووە، لە ژمارە [١٠]ی گۆڤاری [زاری کرمانجی]ی ڕێکەوتی ٣ی تەمـووزی ١٩٢٧دا کە شاعیـریـەتی بەهێـزبـووە، ستـایشێکی [عـەبـدولخـالیق ئەسیـری] کردووەو نووسیویە بۆ کاکـە کەرکـووکی و لەسـەر شێـوەی شیعری نوێی کوردی کە نووری شێـخ سالـح وگۆران دەستیان دابوویە، هۆنراوەیەکی دارشتوە، لێرەدا دوو چواریێیان لێ بڵاو دەکەینەوە :

(٥)

**بۆ کاکە کەرکووکی**

هەموو ئانێك سیمایی پر ویقارت وەك چرایی ڕوون
لە پێش چاوم موجەسـەم هەر ئەوە تیمسالی میللیەت
بە حورمەت ئەی پەرستم پرتەوێکی فەوقی گشت گەردوون
فیدای ئەفکاری میللیت بم ئەتۆی لایق بە قودسیەت
دەخیلە کاکە [کەرکوکی] هەموو یەکسەر کەرو لاڵین
وەتەن بیمارە میللەت نووستوە هاوارە بەد حالینی
تەم و تاریکە ئافاقمان لە ناو بوڵڵان پامالین
چرای عیرفانت هەڵکە باڵ شکاوو بێ پەرو باڵین
«مامە ندکەرکووکی»

ئەگـەر [کـەرکـووکی] نازنـاوی [رەمـزی رەحیم] بوایە ئەوا چۆن دەیگـوت : [دەخیلە کاکـە «کـەرکووکی» هەموویەکسەر کەرو لاڵین]!!

لەمـەش زیـاتـر، لە پەراوێـزی لاپـەڕەی گۆڤـارەکـەی [زاری کرمانجی]دا نووسراوە :

[ئەمەی بۆ سەید عەبدولخالق أثیری داناوە].

٢ ـ لەو کاتـەی کە کاك ئومـێـد دەڵێ : ئەو هۆنـراوەیـەی «وەسیـەت»و دوو شیعـری تر لە ژمـارەکـانی ٤٣، ٤٤ی ڕۆژنامەی ژیانەوەی ساڵی ١٩٢٥دا بڵاوکراوەتەوە، هەستام بە دوای ئەو ژمارانەی ڕۆژنامەکەدا گەڕام، لە ژمارە [٤٣]دا چاوم بە شیـعـرێـك کەوت کە سەرەتـاکـەی بەم جۆرە دەست پێ دەکـات و دەڵێ : [کـوردە وا فتـوادراوە. . .] و، بە ناوی [کـەرکـووکی] یەوە بڵاوکـراوەتەوە. کە ئەمەم بینی یەکسەر بۆم دەرکـەوت، کە شیعـرەکـە هی [ئەسیری] یەو، بەر لەوەی ئەم نازنـاوە بەکـاربێنێ بە ناوی [کـەرکـووکی] یەوە، شیعـری بڵاوکـردۆتـەوەو، بۆپتـر ساغ کردنـەوەی ئەمە، دەگەڕێمەوە بۆ دەسنـووسی [کەشکۆڵی گیو]و، من لە ساڵی ١٩٨٤دا، داوام لە خوشکی بەرێـزم دوکتـۆرە کوردستـان موکریانی کرد تاکو لە کەرەستـەی ئەو کەشـکـۆڵـەی باوکـی هەنـدێ شیعـری بڵاونـەکـراوەی [ئـەسیـری]م پێ بـدات . ئەویش دوای چەند ڕۆژ یـك زەرفێکی گەورەی پێـدام ناوی ئەسیـری لەسـەر نووسـرابـوو، کە لە ناوئـاخنی وردبـوومـەوە بینیم ژیـاننـامەی ئەسیـری تێـدایـە بە قەڵـەمی خۆی، کە لە ساڵی ١٩٤٣دا بۆ خوالێ خـۆش بووگیـوی ناردووە، لەگـەڵ ١٢ هۆنـراوەی نیشتمـانی، یەکێـك لەوانـە هۆنراوەکەی [کوردە وا فتوا دراوە] بوو، هەمـوویـانم لەلای خۆم نوسی یـەوەو کەرەستـەکـانم بە سوپـاسـەوە دایـەوە دوکتـۆرە کوردستـان و ئێستـا لەلای ئەو پارێـزراوەو، دانـەیێکیشی لەلای منـە، کاتێـك کەشکۆڵی گیو چاپ کرا، چوار هۆنـراوەی لەوانـە گرتـەخـۆی بەڵام چونکـە شیعـرەکـەی [کـوردە. . .] ئەمـرۆ بۆبڵاوکـردنـەوە ناشێ چاپ نەکرا کەواتە : هۆنراوەکە هی [ئەسیری] یەو، بە ئیمزای [کـەرکـووکی] بڵاوکراوەتەوە، چونکە نازناوی کۆنی بووەو هەر بەم پێـوانـەیـەش هۆنراوەکەی [وەسیەت] یش مادام بە ئیمزای کەرکووکی یە، ئەمە باشترین بەڵگەیە کە هی [ئەسیری]یە نەك هی [مامەند کەرکوکی].

٣ ـ کاك ئومێـد نووسیـویە [بەڵام لە [ساڵی ١٩٢٧]ەوە هەر لە ژمـارە یەکی زاری کرمـانجی یـەوە بە ئیمـزای [مـامـەنـد کەرکووکی] شیعری بڵاوکردۆتەوە] ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر بڵێ لە [سـاڵی ١٩٢٧]ەوە، ئەوا نابێ بڵێ لە ژمـارە ١)ی گۆڤاری زاری کرمـانجی، چونکـە ژمـارە [١] ی ساڵی [١]ی زاری کرمـانجی لە ١٢ ی زیلقعـدەی ساڵی ١٣٤٤ی هیجـری بەرانبـەر بە حوزەیـرانی ساڵی ١٩٢٦دا دەرچـووەو چوار پارچە شیعری مامەندی بە جاپێك لەو ژمارەیەدا بڵاوکردۆتەوە.

٤ ـ ئەسیـری ئەم هۆنـراوەیـەی [وەسیـەت] ی بۆعەبـدولقادر [قـالـە]ی خوارزای نووسیـوەو هەمـوو شارەزایـانی ئەدەبیـاتی کوردی ئەمـە دەزانن و ئەم عەبـدولقادرەش تا ئێستا لە ژیان دا ماوە، ئەم ڕاستی یـە دەزانێ کە هۆنـراوەکـە بۆئەودانـراوە. لەمەش زیاتر لە دیوانەکەی ئەسیری‌دا لە پەراوێزی شیعرەکەدا نووسـراوە : قالـە : عەبـدولقـادری کوری مستـەفـا ئەفـەندی قەڵـەنـدەرو خوارزای ئەسیـری‌یـە، لە کەرکووك دادەنیشێ لە

گەڕەکی ئەخی حوسەین، لە هەمان خانووبەرەو خانەقادا کە نیشتەجێی «ئەسیری» بوو، بەڵگەیەکی تریش کە شیعرەکە بە هی [ئەسیری] دادەنێ، بەکارهێنانی وشەی [قالە]یەو، شیعری خاڵێکە بۆ خوارزاکەی هەروەکو لەدێری یەکەمی هۆنراوەکەدا ئەمە هاتووەو دەڵێ: ـ

وەسییەت بێ ئەگەر مردم وەرە سەر قەبرەکەم [قالە]
بلێ: ئاواتەکەت پێك هات، هەڵستە بێرەدەر [خاڵە](٦)

لێرەدا بە ئاشکرا دیارە کە شاعیر خۆی [خاڵ]ەو، شیعری بۆ خوارزای داناوە، بەڵام ئەگەر هی [مامەند کەرکووکی] بووبێ دەبێ خۆی خاڵی چ [قالە]یەك بووبێ وچ [قالە]یەکیش خوارزای بووبێ؟!

٥ ـ ئەم بەڵگەو رایانەی کاك ئومێد دەیان هێنێتەوە بۆ هەڵە راست کردنەوەی ئەدەبی، ئەگەر بۆ مەسەلەیەکی کۆنی پێش سەد، سەدو پەنجا ساڵ لەمەوبەر بوایە، ئەوا رێی تێ دەچوو بە هەڵە هۆنراوەی شاعیرێك بدرێتە پاڵ شاعیرێکی تر، بەڵام ئەم مەسەلەیە هی ئەم ساڵانەی دوایی یەو، خاوەنی شیعرەکە لە ژیان دابووەو دەیتوانی لە لای ئەدەب ناسان یاخود لە رۆژنامەو گۆڤاریك دا ئەو هەڵەیە راست بکاتەوە. خۆ [ئەسیری] تا ساڵی ١٩٦٢و [مامەند، کەرکووکی] یش تاکو ساڵی ١٩٦٧ لە ژیان دا مابوون دەیان توانی ئەگەر هەڵەبوایە راستی بکەنەوە.

**بەڵگەی سێیەمی کاکە ئاشنا بۆ روودانی هەڵەکە ئەمەیەو دەڵێ:ـ**

---

[ئەسیری بە پەیرەوی شاعیرە کلاسیکی یەکانی کورد، نازناوی خۆی لە نیوە دێری دوا بەیتی شیعرەکە نووسیوە، بەڵام کە تەماشای شیعری [وەسیەت] دەکەین، هیچ نازناوێکی لەسەر نی یە].

لە وەڵامی ئەم رایەی کاکە ئاشنادا دەڵێم: وەنەبێ ئەسیری هەر لە شیعرەکەی [وەسیەت]دا نازناوی بەکارهێنابێ، بەڵکو ئەگەر چاو بە کتێبەکەی [ئەسیری] چاپی ١٩٧٤و دیوانەکەی [ئەسیری]ی چاپی ١٩٨٧دا بخشێنین، بێ گومان چاومان بە گەلێك هۆنراوەی دیکەی دەکەوێت، کە نازناوی شاعیریان تێدا بەکارنەهاتووە، وەکو ئەمانەی خوارەوە: ـ

١) هۆنراوەی [چونکە بەدبەختی] دیوان ل: ٥٢
٢) هۆنراوەی [پڕ دڵم دەردە] دیوان ل: ٦٩
٣) هۆنراوەی [خوا هەبوو] دیوان ل: ٨٥
٤) سێ هۆنراوە بە ناوی[ستایشی پێغەمبەر] دیوان ل ٨٩ ـ ٩٧
٥) هۆنراوەی [شێوەن بۆ باوکی] کتێبی ئەسیری ل: ١٢
٦) شین بۆ صالح زەکی صاحێبقران کتێبی ئەسیری ل: ٨٤
٧) شێوەنی شێخ محەممەدی کەرەدان دیوان ل: ١٣١

کەواتە: بەکارنەهێنانی نازناو ئەوە ناگەیێنێ کە هۆنراوەکە هی ئەسیری نی یە. لێرەدا راستی یەك هەیە، دەبێ بیخەمەروو، ئەویش ئەمەیە: تەمەنی شاعیریی ئەسیری کۆنترە لە تەمەنی شاعیریی مامەند کەرکووکی، لەو کاتەی کە ئەسیری بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان شیعری داناوەو لە دوای جەنگ و گەڕانەوەی لە گەشتێکی بۆ ئەستەمبوڵ و ئیزمیرو بەیرووت، رێبازی شیعری گۆڕیوەو لە غەزەل لای داوەو، کەوتۆتە سەر شیعری نیشتمانی دانان و لە سەرەتای ساڵەکانی بیستەوە شیعری نیشتمانیو نەتەوەیی لە گۆڤارو رۆژنامەکان دا بلاوکردۆتەوە(٧). دەبینین [رەمزی رەحیم]ی ناودار بە [مامەند کەرکووکی] بۆیەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٦دا شیعری بلاوکردۆتەوە، لەو کاتەی کە مامۆستای قوتابخانە سەرەتایی یەکەی کۆیە بووەو، شیعرەکانیشی لە ژمارە[illegible]ی ساڵی [١]ی زاری کرمانجی نووسیوە، کە گۆڤارەکەی بۆ هاتۆتە کۆیە لەناو پۆل دا بۆ قوتابی یەکان خوێندۆتەوەو هەندێ لەو قوتابی یانەی هۆنراوەکانیان لەبەرکردووە ئێستا لە ژیان دا ماون وزۆر بە وردی باسی [رەمزی رەحیم]ی مامۆستایان کە ناودار بووە بە [مامەند کەرکووکی]و شیعرە نەتەوەیی یەکانی دەگێڕنەوە، لەوانە مامۆستا رۆستەم حەویزی شاعیر [کۆیە ١٩١٣] و مامۆستا عەبدولمەجید نورەدین [کۆیە: ١٩١٢]و مامۆستا عوسمان عەونی شاعیر [کۆیە ١٩١٤] زۆر لە شیعرەکانی سەرەتای شاعیری یەتی [مامەند کەرکووکی] یان لەبەرکردووە، کە لە ساڵانی ١٩٢٥، ١٩٢٦، ١٩٢٧، ١٩٢٨ لە کۆیە مامۆستایان بووە، ئەمە بەلگەیێکی مێژوویی بوولە یادداشتی هەندێ لە قوتابی یەکانی یەوە چنگمان کەوت، بەڵام ئەگەر بە دوای بەڵگەی ئەدەبی بکەوین بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە لە ساڵی ١٩٢٦دا شیعرەکانی زۆر سەرەتایی و سادە بوون و، ئەمەش

ئەوە بگەیێنی کە دەورو بەری ئەوسانە سەرەتای تەمەنی شاعیری [مامەند] بووبی ئەوا رووەکەینە شیعرە بلاوکراوەکانی خۆی بەو سەردەمەدا و دەڵێین :

مامەند کەرکووکی بە بۆنەی دەرچوونی گۆڤاری زاری کرمانجی مژدەنامەیەکی بە شیعر نووسیوەو ئەگەڵ سێ هۆنراوەی تری ناردووە بۆ گۆڤارەکەو. خاوەنەکەیشی واتە : حوزنی موکریانی ئەم پێشەکی یەی بۆ مژدەنامەکە نوسیوەو دەڵێ :

[ئەم چەند شیعرە ئەمن لە تەرەف لاوێکی کە خۆی لە ژێرەوە داناوە بۆمهاتووە، بە بۆنەی پیرۆزیی دەرکەوتنی [جریدەکەمان!!] ئێمەش بە مەمنوونی نەشری دەکەین چونکە مونسەبەی ئەکەن کردنەوەی سەر ئەوجەیی دا هەیە] [٨]. ئەم پێشەکی یە و دەگەیێنێ کە مامەند جاری نەناسراو بووەو حوزنی نەیناسیوەو ئەوەوپێش چاوی بە شیعرو نووسینی نەکەوتووە.

دوای ئەم پێشەکی یە دەقی هۆنراوەکە نووسراوە کە بریتی یە لە سێ پێنج خشتەکی، ئیوە دێری یەکەم و دووەمیان هاوسەرون و سێیەم و چوارەم و پێنجەمیشیان جۆرە سەروایێکی تریان هەیە. لێرەدا پێنج خشتەکی یەکەمیان بەنموونە پێشکەش دەکەین :

مژدەبێ ئەی قەوم کەوا ئەستێرەیی بۆ کورد هەڵات
فەیزبەختی قەومی کوردە، ئاوەدانی بۆ وولات
نونرا بە زاری کرمانجی بە عەونی زولجەلال.
پیشەوای میللەت دەبێ ئەو بۆ بەندی پەرو باڵ.
عەرزی تەقدیست ئەکەین بۆ دانەری مەجدی خصاڵ

[کەرکووکی مامەند]

وەك سەرنج دەدەین ئەم بەشەی هۆنراوەکە، هەست دەکەین زۆر بێ هێزو پیزەو جاری نەبووە بە شیعری پتەوو. دیارە بەرهەمی سەرەتای شاعیری یەتی مامەندەوسێ هۆنراوەکەی تریشی کەلێك لەم پارچەیە لاوازترن وقەت قەناعەتمان نایەت بڵێین : ئەم هۆنراوانە هی شاعیرێك بن، سالێك پێشتر واتە : لە ١٩٢٥دا هۆنراوەیەکی وا جوان و پتەوی وەکو [وەسیەت]ی دانابێ و لە رۆژنامەی ژیانەوەدا بلاوی کردبێتەوەو گوت بێتی :

وەسیەت بێ ئەگەر مردم وەرە سەر قەبرەکەم قاڵە
بێ ئوانەکەت پێك هات هەڵستە بیرەدەر خاڵە
شەهیدی میللەتم تەسلیمی خاکم کەن، گەلی کوردان
بپۆشن خاکی سەر قەبرم بە رەیحان وگوڵ و لالە [٩]

ئەگەر لە زاری کرمانجی دا بە دوای بەرهەمی شیعری و نووسینی [مامەند کەرکووکی بکەوین دەبینین تا ساڵی ١٩٢٧ و ١٩٢٨ نابێتە ئەو شاعیرە باشەی هۆنراوەی بەهێز پێشکەش بکات و هیچ کامێکیان پەنجەیان لە پەنجەی شیعرەکەی [وەسیەت] بدەن. ئەمەش دەبێتە پاڵپشتی ئەو بەڵگەیەی کە دەڵێ : [مامەند کەرکووکی] شاعیری گۆڤاری زاری کرمانجی بووەو لە [ساڵی ١٩٢٦ەوە دەستی کردووە بە هۆنراوە بلاوکردنەوەو. نازناوی [مامەند کەرکووکی] یا [کەرکووکی مامەند] یان [مامەند] یاخود [کەرکووکی] : م. د] ئەم دوو رەمزەش پیتی یەکەم و دوایی ناوی مامەند دەگەیێنن و، هەرگیز بە تەنیا نازناوی [کەرکووکی] لە شیعرنووسین دا بەکار نەهێناوە. چونکە [کەرکووکی] نازناوی پێشووی شاعیری نەتەوەیی کورد [عەبدولخالق ئەسیری : أثیری] بووەو شیعرەکەی [وەسیەت] یش هی ئەسیری یەو نە مستەفا شەوقی و نە مومتاز حەیدەری و نە من و جەباری و نە مستەفا عەسکەری بە هەڵەدا نەچووین و هیوادارم [راست کردنەوەی هەڵە] کەم بە چاکی راست کردبێتەوە.

سەرچاوەو پەراوێزەکان -

١) گوڤاری روشنبیری نوی - ژمارە [١١٨]ی ساڵی ١٩٨٨ - چەند لاپەرەیەکی نوی سەبارەت بە هەردوو مستەفا شەوقی - نومید ئاشنا، ل: ١١٩.

٢) هەمان سەرچاوە، ل ١٩٢

٣) کەریم شارەزاو جەبار جەباری - ئەسیری - هەولێر ١٩٧٤، ل: ٦٠، ٦١، ٦٢

٤) بروانە هەمان سەرچاوە - پاشکو بە قەڵەمی محەمەدی مەلا کەریم: ل ٩١، ٩٢، ٩٣

٥) بروانە گوڤاری زاری کرمانجی ژمارە [١٠] ساڵی دووەم [١٩٢٧/٧/٣] ل: ١٧

٦) مستەفا عەسکەری - دیوانی ئەسیری - بەغدا ١٩٨٧، ل: ٤٣.

٧) نامەیەکی دەستنووسی ئەسیری بۆ گیوی موکریانی لە رۆژی ٩/٣/١٩٤٣دا. هەروەها بروانە دیوانی ئەسیری - مستەفا عەسکەری ل: ١٠.

٨) گوڤاری زاری کرمانجی ژمارە [١] ساڵی [١] حوزەیرانی ١٩٢٦، ل: ٢

٩) مستەفا عەسکەری - دیوانی ئەسیری بەغدا ١٩٨٧، ل: ٤٣، ٤٤.

# شوێن دەستی
# شێخ حوسەینی قازی
# لە دانانی
# بناغەی ئەدەبی کوردیمان دا

● محمود أحمد محمد سلێمانی

شێخ حوسەینی قازی کوڕی سەیید مەحموودی نەقیبی کوڕی شێخ مارفی کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیەو بە بنیچە دەچێتەوە سەر سەیید عیسای بەرزنجی [1].

لە دایکیشیەوە شێخ مارفی نۆدێ دەبێتە باپیری‌و «کاکە حمەدی شێخ» یش دەبێتە خاڵی، کە وابوو لە دایك و باوکەوە سەیید نژادەو مەلازادەو خانەدان و جێ‌گەورەیە. شێخ حوسەین لە ڕۆژگاری فرمانڕوایی چوارەمین جاری ئەورەحمان پاشای بابان دا، لەشاری سلێمانی ساڵی ١٢٠٥ی کۆچی = ١٧٩٠ی زایین چاوی بە جیهان هەڵێناوەو هاتۆتە کوڕی ژینەوە [2]، لە ئامێزی بنەماڵەیەکی ئاوەها نەجیب و خانەدان دا پێگەیشتوەو چاوی کراوەتەوەو دەست و دووی خۆی ناسیوەو چاك و خراپی لێك جیاکردۆتەوە هەروەکو داب و نەریتی باوی ئەوڕۆژگارە بە مێرمنداڵی نێردراوەتە لای مەلاو دەستی بەخوێندن کردووە. کاتێك قورئانی پیرۆزو کتێبەسەرەتاییەکانی باوی ئەو سەردەمەی خوێندون، ئەمجار چۆتە مزگەوتی گەورەو لەخوێندگای مزگەوتی گەورەدا خەریکی خوێندن بووە، هەروا چەند حوجرەو مزگەوتی تریش ـ بە مەبەستی خوێندن ـ گەڕاوە، هەتا لەکۆتایی دا لەلای شێخ مارفی نۆدێ ئیجازەنامەی عیلمی وەرگرتووە بڕوانامەی مەلایەتی و دەرس وتنەوەی پێ دراوە، ئەنجا بە ڕەسمی لەلایەن بابانەکانەوە کراوە بە مەلاو دەرس وتنەوەی پێدراوە، ئەنجا بە ڕەسمی لەلایەن بابانەکانەوە کراوە بە مەلاو دەرس بێژی مزگەوتێك لەگەڕەکی سەر شەقامی سلێمانی کەئێستا ناونراوە «مزگەوتی شێخ حوسێنی قازی» یان «مزگەوتی مەلا واحید» [3] ئیتر بە لێبڕان و بە لێهاتوویی‌یەوە خەریکی دەرس وتنەوەو فێرکردن و نووسین و لێکۆڵینەوە دەبێ، وەکوو ئەستێرەیەکی گەشەدار بە هەر چوار دەوری خۆیدا پرتەوبەخش بووەو زانیاری بڵاوکردۆتەوە، بۆیە پاشاکانی بابان زۆر ڕێزیان لێ‌گرتووە وێڕای وەزیفەی دەرس بێژی‌و پێشنوێژی مزگەوت، کردوشیانە بە قازی سلێمانی‌و ئیش و کاری دادگایان پێ سپاردووە، ئیتر نازناوی «قاضی» لێنراوە خراوەتە سەر ناوەکەی‌و بە «شێخ حوسەینی قاضی» ناوبانگی دەرکردوە لەتەك ئەم وەزیفانەش دا وەزیفەیەکی‌تر گرینگی خراوەتە ئەستۆ ئەویش وەزیفەی «کاتب الدیوان» نامەنووسی بووە لە دیوانی پاشاکانی بابان [4].

خوالێخۆشبوو مامۆستا «محمد مصطفی کوردی» دەیفەرموو: زۆر جار لە باوکم بیستووە دەیکووت شێخ حوسێنی قازی لە هونەری نامەنووسین دا زۆر دەستێکی باڵای هەبوە بۆیە میرەکانی بابان هەموو کاغەزێکی گرینگیان بە ئەم نووسیوە، زۆر جاریش کە نامەکە نهێنی نەبووبێ فەقێ‌و مەلاکان لێیان وەرگرتووە لەبەریان نوسیوەتەوە وەکوو نموونەو ناوازە دەستاو دەستیان پێ‌کردوە. شێخ حوسێن یەکێك بووە لە پیاوە ناودارەکانی سلێمانی‌و دەوروبەری، یەکێك بووە لەزاناو هەڵکەوتوە کانی فرمانڕەوای بابان شەرەفی عیلم و نژادی تێدا کۆبۆتەوە، زیاد لەمەش دەم و گفت و زوبان شیرین و قسەڕەوان و قسە بەجێ بووە زۆر حازر جواب و زیرەك ژیرو هۆشمەند بووە توانیویەتی قسە بخاتە شوێنی خۆی بۆ هەموو کۆڕو مەجلیسێك قسەی تایبەتی خۆی لا حازربووە، لەگەڵ ئەمەشا بە سیاسی‌و عاقڵ مەندێکی کەم وێنە ناسراوە بە تایبەتی زۆر باش زانیویەتی چۆن قسەو گوفت و گۆ لەگەڵ میرو سوڵتان و فرمانڕەوایان دا ئەنجام بدا ئوسلوب و گوفتارو دوانی زۆر سەرنج ڕاکێش بووە، زۆر زوو توانیویەتی بەرامبەری خۆی بۆر بداو ڕێگەی لێ ببڕێتەوەو ڕای خۆی بچەسپێنی [5].

بۆیە چەند جارێك بابانەکان ـ وەکو سەفیرێك ـ ناردوویانە بۆ ئاستانەو بەغداو هەروا بۆ لای فرمانڕەواو کاربەدەستانی دەوروپشتی وڵاتی بابان، تەنانەت کە مەولانا خالیدو شێخ

مارفی نۆدێ لەیەکتری دڵ نیگەران بوون و نیزاع و کێشەیان کەوتوتە نێوانەوەو بەسەردا مەولانا خالید چووەتە بەغداو دوایی شێخ مارف ویستویەتی ئاشتی بکاتەوە، هەر شێخ حوسێن هەڵبژێردراو کە لەگەڵ شێخ ئیسماعیل بەرزنجیدا بچن بۆ بەغداو وتوویژ لەگەڵ مەولانا خالیدا بکەن و ئەم ئاگرە بکوژێننەوە (٦).

سەیر ئەوە بووە شێخ حوسێن بۆ هەر شتێ چووبێ زۆر زوو بۆی مەیسەر بووەو هەموو جارێ سەرکەوتنی بە دەست هێناوە.

هەر وەها مەشهوورە کە شێخ حوسێن زۆر حەزی لە سەفەرو هاتوو چۆ بووە، زۆر شەیدای دیتنی وڵاتان وگەشت وگوزار بووە، بۆیە زۆر گەشتی هەندەرانی کردوە.

ئەڵێن: جارێکیان ساڵی ١٢٦٩ك = ١٨٥٣ز لەگەڵ کاکە حەمەدی شێخ دا ـ کە خاڵی بووە ـ سەفەری بەغدایان کردوە بەمیوانی لای شێخ موحەممەدی فەیضی زەهاوی دابەزیون عەبدولباقی ئەلعومەری؛ کە لە شاعیرە ئەوکاتەی عیراق دیدەنی لێ کردوون، چونکە دۆستایەتی وناسیاوی یەکی گەرمی لەگەڵ شێخ حوسێن دا هەبووە هەرکە عەبدولباقی دەگاتە لایان بە سەرپێی یەوە ئەم شیعرەیان بۆدەڵێ و بەخێرهاتنیان دەکاو دەڵێ:

شُرِّف بغدادُ كما شُرِّف ال عرش بنعلي جدك الأعلى

ئیتر شێخ حوسین خێرا بەم دوودێرە شیعرە وەڵامی عەبدولباقی دەداتەوەو دەڵێ:

جسمي بجميعه بحق الباقي في الحب غدا منازل الأشواق
امّا خلدي فقد غدا ذالهب من فرقتكم فكيف حال الباقي؟

حاجی مەلا رەسوڵی دێلێژە [موخلیس] شێخ حوسین بەرامبەر بە کاك ئەحمە دادەنێ و دەڵێ
مەدینەی موڵکی بابان [موخلیسا] یەعنی سولە یمانی
کە جێی دوو حەزرەتی وا بێ، ئەبێ وەك کەعبەتوڵڵا بێ

شێخ حوسێن بەم جۆرە رۆژگاری بە سەر بردوە هەتا ساڵی ١٢٨٥ی ك = ١٨٦٨ / ١٨٦٩ی ز لە سلێمانی بۆدوا جار چاوی لێك ناوەو دنیای بەجێ هێشتوە چۆتە جێگای حەقی خۆی لە گردی سەیوان نێژراوە هەزار رەحمەت لە گۆری (٧).

## نوسراوو بەرهەمی شاعیر

شێخ حوسێن لەماوەی ژیانی پرپیت وبەرەکەتی دا، چەند شاکارێکی ئەدەبی وزانستی ئاینی بۆ بەجێ هێشتوین؛ چەند پارچە شیعری تەرو پاراوچەند کتێبی بە ناووداو، چەند وردە نوسراوی رێك و پێك و تەواو، لەمانە:

١ ـ پەراوی «سراج السالكين» بە پەخشانی فارسی (٨).

٢ ـ سەرگوزەشتەی «مەجنون و لەیلا» بە شیعری عەرەبی (٩).

٣ ـ سەرگوزەشتەی «صەنعان و تورسا» بە شیعری فارسی (١٠).

٤ ـ «مەولوود نامەی پێغەمبەر» بە پە خشانی کوردی کە ئەمیان تەقەڵلاو تاقیکردنەوەی دووەمە لە پەخشانی هونەری بەشێوەی کوردی کرمانجی خوارو بناغەو سەرەتای پەخشانی [سەجع] یشە بەو شێوە کوردیە. ئێمە لە بەشی دووەمی ئەم نووسینەدا بەدرێژ ی باسی لێوە دەکەین.

٥ ـ هەر وەها چەند [مقامات] و[مقالات] و[رسائل] ی هونەری بە زمانی عەرەبی کە ئێستا برێك لەو نووسراوانە لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی سلێمانی دا پارێزراون (١١) هەر خوا خۆشی دەزانێ چەند نامیلکەو نووسراوی تریشی بووەو فەوتاوە، یان پێی نەزاندراوە.!!!

## شوێن دەستی شێخ حوسین لە رۆڵی و بژەیی کوردیدا

وەکو وتمان شێخ حوسێن زانایەکی ئاینی بە ناوبانگ و خواپەرست و خزمەتگوزارو بووە لەهەمان کاتیش دا شاعیرو نووسەرێکی خاوەن دەسەڵات وزمان پاراووبیر تیژ وقسە رەوان بووە خاوەنی خەیاڵێکی وردو هەستێکی ناسك و سۆزێکی گەرم وئەزموونێکی تایبەتی بووە بە وێنەکێشێکی شیعری پێشکەوتوو دەژمێردرێ، بە زمانی عەرەبی وکوردی و فارسی و تورکی شیعری پر سۆزو ئەندێشەی چراندون و ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند کردووە، بەڵکو دەتوانین بڵێین بناغەی ئەدەبی کوردی بە دیالێکتی کرمانجی خواروو ـ ناوچەی سلێمانی ـ دارشتووە چەند ساڵێك پێش مامۆستا [نالی و سالم و کوردی] شیعری بەو شێوە دیالێکتە نووسیوە، یان هیچکە نەبێ لەتەك ئەوان دا بەم شێوە زاراوەیە شیعری

وتووە. ئەمەش ڕاستی یەکەو حەقیقەتێکە پێویستە نووسەرانمان لەکاتی لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی قوتابخانەی نالی و سەرەتای سەرهەڵدانی شیعری کلاسیکی کوردی بە شێوەی کرمانجی خوارو پەنجەی بۆ ڕابکێشن و لەبیری نەکەن و مافی خۆی بدەنێ!!

هەرچەندە داهێنان و قوڵ بونەوەو هونەرایەتی و ڕابەرایەتیەکە هەر بۆ مامۆستا «نالی» دەچەسپێ و هیچ کەس گۆی هونەری لێ نەبردوتەوەو تا ئێستا گەلی کورد شاعیرێکی تری وەکو «نالی» لەو شێوە شیعرەدا تێدا هەڵ نەکەوتوتەوە!! بەڵام ناگونجێ و ڕەوانی یە کە بڵێین: قوتابخانە شیعری بابان لە پڕێکا وەکوو قاچلك هەڵتۆقیوتەوەو لەسەر دەستی [نالی] سەری هەڵداوە بێ پێشەکی و تاقیکردنەوەی شاعیرانی تر [نالی] یەکسەر ئەم شیعرە بەرزانەی هێناوەتە ئاراوە، ئەمە شتێکە عەقڵ وەری ناگرێ.

کەوابوو دەبێ - پێش نالی و لەگەڵ نالی دا - چەند شاعیرێکی تر دەمیان بۆ ئەم جۆرە شیعرە برویێ و خۆیانیان تێدا تاقی کردبێتەوە بڕێکیان لە تاقیکردنەوە کەدا سەرکەوتوبون و بڕێکیشیان فێش؟!

تا لەئەنجام دا نالی - بەو ئەزمونە هونەرییەی خۆی - قوتابخانە شیعری یەکەی گەیاندوتە ئەو پاپە بەرزەی کە ئەمرۆ ئێمە دەیبینین. گومانیشم لەوەدا نی یە کە یەکێك لەو شاعیرانەی پێش نالی دەستی بۆ ئەم جۆرە شیعرە بردبێ و خۆی تێدا تاقی کردبێتەوەو سەرکەوتووش بووبێ شێخ حوسێنی قازی یە!!؟!

جا هەرچەندە شیعرەکانی شێخ حوسەین - وەکوو هەموو شیعری شاعیرانی ئەو سەردەمە - هەر باسی زولف و خاڵ و چاوی ڕەش و بڕۆی کەوان و گەردن و باڵای بەرزو قەدی بارێك و شوش و ئەوجۆرە مانایانە دەکەن و لەم چوار چێوە دەرنەچوون، بەڵام لە ڕووی هەست و سۆزو ئەزموون و ئەندێشەوە تا بڵێی بەرزو ناسك و پڕ سۆزو عاتیفەن، تابلۆی جوان و وێنەی شیعری ڕەنگاو ڕەنگ و مانای قوڵ ووردیان لە خۆ گرتوە، بە جۆرێك دەتوانین بڵێین: شیعرەکانی نمونەی شیعری سەرکەوتوو کامڵ و پڕ ماناو ڕێك و پێکن.

بەڵام ئایا ئەم عەشق و ئەوینەی شاعیر عەشق و ئەوینێکی ڕاستەقینەیەو هەڵقوڵاوە لە دەروونێکی سەرکەش و پڕ سۆزو هەستێکی دڵداری واقعی یە؟! یان لاساکردنەوەو خۆ تاقیکردنەوەیەکی ڕواڵەتییە!؟ بەڕاستی وەڵامی ئەم پرسیارە هەروا بە ئاسانی لێرەدا نادرێتەوە، چونکە پێویستە ئێمە مێژووی دانانی شیعرەکان بزانین، هەروا بۆمان ڕوون بێتەوە کە ئەم شیعرانە زادەی چ تەمەنێکی شاعیرن و لە چ کات و زروفێك دا ئەم شیعرانەی بۆ هاتووە.

لە تەك ئەمەشا گەرەکە بزانین ئاخۆ شاعیر دڵدارێکی تایبەتی هەبوە کە کاری لە هەست و دەروونی کردبێ و ئەمیش بەم شیعرانە کەف و کوڵی دەرونی خۆی هەڵڕشتبێ و بەمە تۆزێك تەم و مژی خەم و خەفەتی لە خۆی ڕەواندبێتەوە!؟!

## نازناوی شاعیر

وەکوو لە کۆتایی شیعرەکانی دا دەردەکەوێ دیارە کە شێخ حوسێن نازناوی [بیمار] ی بۆ خۆی هەڵبژاردوەو شیعرەکانی خۆی پێ مۆر کردون. وەکو دەشزانین مستەفا بەگی کوردیش بۆ ماوەیەك نازناوی [بیمار] بووە بۆ برێ لەشیعرەکانی ئەم نازناوەی داناوە، مامۆستا حەمە بۆر لە کا غەزێکا بۆی نوسیووم کە شاعیرێکی تریش هەبووە خەڵکی ناوچەی قەرەداخەو نازناوی [بیمار]ی بۆ خۆی هەڵبژاردوە. بەڵام ناوە سەرەکیەکەی بۆ نەنووسیبوم. بەڕاستی جیاکردنەوەی شیعری مستەفابەگ - ئەوانەی بە نازناوی بیمار نووسراون - لەشیعری شێخ حوسێن کارێکی ئەستەمەو وا بە ئاسانی ئەنجام نادرێ!؟!

پێش ئەوەش بێمە سەر ڕاگوێز کردنی چەند پارچەیەك لە شیعرەکانی شاعیر دەمەوی ئەوە بڵێم: کە شێخ حوسێن شیعری کوردی زۆر بووە زۆریشی فەوتاوە مامۆستا شێخ «محمد»ی خاڵ دەفەرموێ زۆرم شیعری ئەو - واتە شێخ حسین - لایە، واش بە تەما بووە نوسینێکی دوورودرێژی لەسەر بنووسێ بەڵام بە داخەوە تا ئێستا بۆی نەکراوە تازە بۆشی ناکرێ (١٢).

ئێستاش وا پێنج پارچە شیعری شاعیر - بۆ نموونە - دەخەینە بەرچاو، هیوادارین ڕۆژێك بێ شیعری شێخ حوسێنی قازی لە دووتوێی دیوانێکی خنجیلانەدا چاوی خوێنەران ڕوون بکاتەوەو کەلێنی خۆی لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ بکاتەوە، هەر کەسێکیش ئەم کارە پیرۆزە بخاتە ئەستۆی خۆی بەندە

بەوپەڕی تواناوە یارمەتی دەدا.

مامۆستا حەمە بۆر ـ کە بۆ ئەم نووسینە زۆر یارمەتی دام ـ ڕۆژی ٩/٤/١٩٨٨ لە بەغداوە تەلەفوونی بۆ کردم وتی: [لە ساڵانی چلەکان دا لەلای میرزا عەبدوڕڕەحمانی بانەیی کەشکۆڵێکم دیوە پێنج سەد لاپەڕەیەك دەبوو سەیید مەحموودێك یان ئەحمەدی نەقیب نوسیبوویەوە زۆر شیعرو بەرهەمی شێخ حوسێنی قازی تێدا بوو. . .] خۆزگە ئەو کەشکۆڵەش سەری هەڵدەدایەوە!!؟

ئەمەش دەقی پێنج پارچە شیعرەکانە[١٣].

پەنجە، بۆ تەصویری ئەبرۆت پەیرەوی مانی دەکا[١٤]
خامە، بۆ زنجیری گیسووت عەنبەر ئەفشانی دەکا[١٥]
قوتی ڕۆحە لێوەکەت یاقوت وەها ئاودار نیە
مەنعی بازاڕی عەقیق و لەعلی ڕوممانی دەکا[١٦]
دڵ بە نەشئەی عەکسی مەستی چاوەکەت «لا یعقل»ە
بۆ کەبابی جەرگە و دڵ لێوت نمەکدانی دەکا
گەر لە پەردەی نازەوە ئاوازی تۆ بگرێتە گوێ
طوطیی شیرین زوبان ئاوازی خۆشخوانی دەکا
لێوی یاقوتت نگینی خاتەمی نادر ظوهوور
مۆری دەستی ئاصەفە ئەمری سولەیمانی دەکا[١٧]
سا هەزار جارت دەخیل بم حەرفی بەدکار مەشنەوە[١٨]
هەر کەسێ باسم بکا پێی بێژە شەیتانی دەکا[١٩]
کەس نیە ئەو شۆخە حاڵی کا لە سۆزەی ئاتەشم
پێی بڵێین «بیمار» لە عەشقت وا غەزەلخوانی دەکا.

تەماشای گۆی زەنەخدانت دەڵێی نارنجی بەغدایە
نیگاهی چاوی فەتتانت دەڵێی ئاهوویی صەحرایە
بە صورەتخانە: ڕوخسارت، بە ئەبرۆیی قەڵەمکێشت[٢٠]
دەڵێی صەفحەی سطووری موصەفی «طاسین و طاهایە»[٢١]

یەقین ئەمڕۆ وەکوو یوسف نیقابت داوەتە لاوە
کە بەم ڕەنگە لە هەر سۆ شۆڕش و فریادو غەوغایە
سەراپای قامەتت بەس دلبەرە ڕەعناوو مەوزوونە
بە مەحبوبییو مەوزونی دەڵێی سەروی دڵارایە
فیدایی شەککەری لێوت شیفایی دەردی «بیمارە»
دەهانی قەندەقینت پڕ لە مرواریی دەریایە[٢٢].

نیگاهی جادوانت باعیثی تاراجی ئیمانە[٢٣]
تەبەسسومکردنی لێوت ڕفانیدەی دڵ و جانە[٢٤]
دو زولفت دوو شەبی دەیجوورە دوو ئەبرۆت هیلالی نەو[٢٥]
دەرەخشندەو مونەووەر، عارضت وەك ماهی تابانە[٢٦]
لە حەسرەت یوسفی گومگەشتەیی نوری جیهان بینم[٢٧]
فیراق و ماتەو ئەندووهی دڵ وەك پیری کەنعانە[٢٨]
دڵەی بیسمیل لە سینەم دا بە نەوعێ دەست و پێ دەکوتێ
دەڵێی کوشتەی لە ژێر تیغی قەصابیی جەژنی قوربانە
لە جۆشی ئەشکی خوێنینم سەراپا گولگولە جیسمم[٢٩]
یەقین دیسان دڵی «بیمار» زەدەی سۆفاری موژگانە.

لە سەودای فیرقەتت ڕۆژم وەکوو زولفت شەوی تارە[٣٠]
بە یادی چاوی بیمارت دڵم دائیم بریندارە
کە یادی پیرەهەنێ ئاڵێ دەکەم دڵ وا بەتاو دەگری
سورشکی جۆششی گریانی چاوم نەوعی گوڵنارە
لە فیرقەت نەوگوڵی باغی بەهاری عاریفی یارم
دڵی سەودازەدەم دائیم وەکو نەی هەر بە هاوارە
مەگەر باعیث بە هیجرانە، وەها لێلاوە بینابیم
کەوا ڕۆژی ڕوناك ئەمڕۆ لە پێش چاوم شەوی تارە
ئەگەر ئاهم کڵەو گیربێ لە دەورم شین بکەن یاران
هەموو شەو دەفعەیی ئەم عیللەتە قانوونی «بیمارە»[٣١].

دڵم نایە بڵێم: ئەم چەترە نیم چینە عەرەقچینە
وەکو طاووسی هیندو شاهینی سەرسەوزو شیرینە
ڕەم و ڕاکردن و وەستانەو ڕوانینی دووبارەت
بە تەرزی ئاهوویی وەحشی چەریدەی دەشتی ماچینە
صەفی موژگان بە جەمعییەت لەگەڵ قەوسی برۆو چاوت
دەڵێی: تیرو کەوان و تەرکەش و بارام و پەروینە
ئەگەر تەصویری شیرینی موقابیل کەم بە مەنظەردا

لەلای شیرین شوناسان هەروەکو طاووسی پۆرچینە
بە یادی گوشەوارەی ڕەنگی لوئلوئی طەلاکارت
سروشکی قەطرە بارانی دوو چاوم نەقش و پەروینە
بە سۆفاری موژەو پەیکانی تیری هێندە «بیمار»م
کە نارم هەر تەرەف تێفکرە وەك گوڵێکی خوێنینە

## پەراوێزەکان

١ ـ الشیخ معروف النودهی البرزنجی دانراوی شێخ محەمەدی خاڵ ل ٨٣ هەروا شەجەرەی شێخەکانی گڵەزەردە دەستنووس لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی سلێمانی، شایانی باسە کە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لە پەراوێزی نوسینێکیدا لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی بەرگی هەشتەم لاپەڕە / ٢٠٠ دەڵێ شێخ حوسێن کوڕی سەیید مەحموودی کوڕی شێخ مارفی نۆدێیە دیارە ئەمە هەڵەیەو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە نوسیومانە مامۆستا لێی تێك چووە.

٢ ـ دەربارەی مێژووی لەدایکبوونی شێخ حوسێن و لە دنیا دەرچوونی چەند جیاوازییەك هەیە، ئەوەتا «تاریخ السلیمانیة و انحائها» وەرگێڕانی مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لاپەڕە / ٢٤٦ ساڵی لەدایکبوونی داناوە بە / ١٢٠٥ك ١٧٩٠ز مێژووی لە دنیا دەرچوونیشی بە / ١٢٨٥ی کۆچی ١٨٦٨ / ١٨٦٩ی ز داناوە ڕۆژنامەی «ژین» ی ژمارە [١٣٣٧] ی ١٩٥٧/٣/٢١ هەر ئەوەی [تاریخ السلیمانیة] ی نوسیوە پەراوێزی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری» یش بەرگی ٢٠٠/٨ هەر ئەو مێژووەی نوسیوە بەڵام مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە کتێبی «الشیخ معروف النودهی» ل ٨٣دا ساڵی لەدایکبوونی بە / ١٢٢٥ی کۆچی ١٨٧٥ی زایینی داناوە هەروا لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە [١] بەرگی سێیەم ل ٦٧٩ ساڵی لە دنیا دەرچوونی بە ١٢٩٢ ی کۆچی نوسیوە. مامۆستا «مەلا عەبدولکەریم» یش لە کتێبی «علماؤنا» دا ل ١٧٤ هەر ئەوەی مامۆستای [خاڵ]ی ڕاگوێزاوە.

٣ ـ التعریف بمساجد السلیمانیة / ملا محمد القزلجی ل ٥٢.

٤ ـ زۆربەی ئەم قسانەم لە مامۆستای خوالێخۆشبوو: «محمد. مصطفی کوردی» بیستووە لەم بارەوە زۆری سەرگوروشتە لەلابوو، هەروا لە [ژین]ی ژمارە [١٣٣٧] دا ئیشارە بۆ قسەی خۆشی شاعیر کراوە، بۆ نموونە دەڵێن ڕۆژێکی ساردی زستان قوتابییەکی خۆی دەنێرێ بۆ ئێشێك قوتابییەکە دەڵێ قوربان! گۆرەوێم لەپێدا نییە «پێم دەچێ» شێخ حوسێن دەڵێ: ئەگەر زۆرت پێ بچێ زۆرت پێ دەچێ ئەگەر [illegible]ت پێ بچێ کەمت پێ دەچێ!

٥ ـ هەمان سەرچاوە.

٦ ـ کتێبی «الشیخ معروف النودهی البرزنجی» دانرای شێخ محەمەدی خاڵ ل ٨٣.

٧ ـ تاریخ السلیمانیة وانحائها هەمان سەرچاوە [الشیخ معروف النودهی] هەمان سەرچاوە.

٨ ـ نوسخەیەکی ئەم کتێبە دەستنووسە لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیدا هەیە بە ژمارە.

٩ ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری / مخطوطات محمد الخال ژمارە [ ١ ] بەرگی [ ٣ لاپەڕە / ٦٧٩.

١٠ ـ الشیخ معروف النودهی / محمد الخال ل ٨٣ «ژین» ژمارە ١٣٣٧.

١١ ـ دەستنووسی ژمارە [٣٤٧٧١ ـ ٣٤٧٧] لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی سلێمانی.

١٢ ـ الشیخ معروف النودهی هەمان سەرچاوە ل ٨٣.

١٢ ـ شیعرەکان ڕاستەوخۆ لە دەستنووسی ژمارە [٣٦١٧] وەرگیراون ئەمجار بەراورد کراون بە کەشکۆڵی مینای شکستە بەرگی یەکەم [ ل ٢٥٠ ] هەروا کەشکۆڵی [نوسراوی پەریشان] ل ٣٣٧ ـ ٣٣٨ کە مامۆستا حەمە بور بە [illegible] بۆی ناردووم. مامۆستا ئەوەشی بۆ نوسیبووم کە دەقی ئەم شیعرانە [illegible] «کەشکۆڵستان» بەرگی دووەم «بەشی بابان» یش دا هەن کە ئێستە لای مامۆستا «محەمەد علي» قەراخی]ن. هەروا ئەو پارچە شیعرەی کە بە «پەنجە بۆ تەصویری... هتد] دەست پێدەکا لە [ژین] ی ژمارە [١٣٣٧ ]دا بڵاوکراوەتەوە. ئەو پارچەیەش کە بە [نیگاهی جادوانت... هتد] دەست پێدەکا لە [ژین]ی ژمارە [٩١٧]ی ساڵی ١٩٤٨ دا بڵاوبوتەوە.

١٤ ـ مانی: وێنەکێشێکی بەناوبانگی ئێرانی بووە، لەڕۆژگاری بەهرامی یەکەمی ساسانیدا لەبەر دەرگای شاری جوندیسابوردا هەڵیان واسی.

١٥ ـ عەنبەر: ـ گیایەکی بۆن خۆشە. عەنبەر ئەفشان: کینایەیە لە نوسینی وەصف و سەنای جوان و شیعری نایاب

١٦ ـ عەقیق: ـ ئاقیق جۆرە بەردێکی بە قیمەتە زۆرتر دەکرێتە نقیمی ئەموستیلە لە هەموو جۆرە ڕەنگێکی هەیە بەڵام جوان ترو بە بەهاتریان ئەوەیە کە ڕەنگە سوری مەیلەو ئاڵە. لەعل: بەردێکی سوری گرانبەهایە لە کان دەرئەهێنرێ

١٧ ـ ئاصەف: مەبەستی ئاصەفی بەرخیای وەزیری حەزرەتی سلیمانە.

١٨ ـ [بەدکار]، لە نوسخەکانی مامۆستا حەمە بوردا نوسراوە [ناکەس].

١٩ ـ [پێی بێژە] نوسخەی ئەوقاف، [بێ شوبهە] نوسخەی حەمە بور

٢٠ [قەڵەمکێشت] نوسخەی ئەوقاف، [قەڵەمکارت] نوسخەی حەمە بور.

٢١ ـ طاسین و طاها: دوو سورەتی قورئانن، لە نوسخەی حەمە بوردا [یاسین و طاها] نوسراوە ئەو کاتە وەکوو دوو سورەتی قورئانن دوو ناوی پێغەمبەریشن.

٢٢ ـ فەندەق: بەندق، جۆرە بەردێکی وەکو گوێزوایە بەڵام چوکترە.

٢٣ ـ [جادوانت]، لە نوسخەی حەمە بوردا نوسراوە [حاودانت] لە «ژین»ی [٩١٧و ئەم نیوە دێرە ئاوا نوسراوە.

«نیگاهی چاوی جادوت ڕەهزەنی کاروانی ئیمانە».

٢٤ ـ [ڕەفانیدە]، لە نوسخەی حەمە بوردا نوسراوە «ئایینە».

لە [ژین]ەی ژمارە [٩١٧] دا ئەم نیوە دێرە بەم جۆرەیە.

«شەکەر خەندەی دوو لێوت پێوەندی دڵ و جانە».

٢٥ ـ دوو زولفت، لە [ژین]ی ژمارە [١٩٧]دا «سیەهـ زولفت». ئەم نیوە دێرە لە نوسخەی حەمە بوردا بەم شێوەیە «دوو زولفت دوو شەوی دەیجور و ئەبرۆت هیلالی ئەو»

٢٦ ـ «لەژێر سایەی هیلالا ڕومەتت وەك ماهی تابانە» ژین / ٩١٧

٢٧ ـ «لە حەسرەت یوسفی گومگەشتە کوێرایی بەچاوما هات» ژین / ٩١٧

٢٨ ـ «لە ئەندوهو فیراق و ماتەما دڵ پیری کەنعانە» ژین / ٩١٧

+ + بیسمیل: واتە حەیوانی سەربڕاو کە پێش گیان دەرچوونی لنگەفرتێ دەکا.

٢٩ ـ هیسمم لە دەستنوسەکەدا [جەم] نوسراوە.

لە [ژین]ی ژمارە [٩١٧] دا ئەم نیوە دێرە بەم جۆرەیە [بەڕەنگی ئەشکی خوێنینم سەراپا گوڵگوڵە باخم».

٣٠ ـ «لە سەودای فیرقەتت» لە دەستنووسی کتێبخانەی ئەوقاف دا نوسراوە [سوار فیراقتێ] لێرەدا نوسخەی «مامۆستا حەمە بور» م هەڵبژارد...

هەروا چەند وردە جیاوازی تریش هەن بە پێویستم نەزانی بیانخەمە ڕوو.

٣١ ـ قانوون: وەکو بە مانا دیاسایە» ئامێرێکی مۆسیقاشە.

# لە نێوان

# پیرەمێردو نجم الدین مەلا - دا

ئومێد ئاشنا

- عزت محی الدین - پیرەمێردی نەمرە!

- بێ کار - نجم الدین مەلایە!

لەنێوان پیرەمێردو نجم الدین مەلادا پەیوەندی‌یەکی نزیکی ئەدەبی هەبووە، هەرجارە کە نجم الدین مەلا - یەکێك لە کەشکۆڵەکانی خۆی نووسیوەتەوە، جێگای تایبەتی بۆ بەسەرهاتی ژیانی پیرەمێردو بەرهەمەکانی تەرخان کردووە، تەنانەت پیرەمێردیش یەکێك لە شیعرە وەرگێرراوە بەناوبانگەکانی خۆی پێشکەش بە نجم الدین مەلا کردوە، کە دەڵێت: -

**«خەیاڵێ وا لە باخەڵما بە توێی پیراهنە ئەمشەو**

**بە وەسڵێکی خەیاڵ دەورەم سەرانسەر گوڵشەنە ئەمشەو»**[1]

ئنجا لە کاتێك دا کە شیعری - بەهاری -، لە رۆژنامەی ژینی ژمارە - ٦٢٢ - ی مارتی ساڵی - ١٩٤١ -دا بە ناوی - عزت محي الدین - ەوە بڵاودەکاتەوە، کەس نازانێ ئەم شیعرە هی پیرەمێردەو عزت محی الدین، بوونی نی‌یەو پیرەمێرد لەبری ناوی خۆی دایناوە لە راستی دا هەتا ئێستا شیعرەکە بە شیعری پیرەمێرد نەزانراوەو بێ کاریش کە ئاشکرای کردووە شیعری پیرەمێردە نەزانراوە کە نجم الدین مەلایە ئەم باسەی ئێمە گرنگیەکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش لە چەند لایەنێکەوە، یەکەم دۆزینەوەی شیعرێکی زۆر جوانی ون بووی پیرەمێرد، دووەم نووسینێکی بەنرخ و پڕ لە زانیاری

نجم الـدین مەلا کە شاردراوە بووە، سێیەم نووسینەکە گەلێ لایـەنی ئامـاژەکـردنی تێدایـە بۆناوی بابـەت و کەسـانی شاردراوەو ون بوو کە ئەم باسە دەبێتە کلیلێك بۆ کردنەوەی ئەو دەرگـایـە لەسـەر چەنـد باس و رازێکی لەیادکراوو بۆمێژ ووی ئەدەب و ژیانی تایبەتی هەریەك لە پیرەمێردو نجم الدین مەلا ـ سوود دەبەخشێت، لێرەدا شیعرەکەی ـ عزت محی الدین واتا ـ پیرەمێرد ـ و نووسینەکەی نجم الدین مەلاو وەلامەکی پیرمێرد لەم بارەیەوە پێشکەش دەکەین : ـ

**«بەهاری»**

**«وا بەهار هات لەلاوە**
**تاوس چەتری هەڵ داوە**
**نیرگس ڕوناکی چاوە**
**ڕیحانە زولفی خاوە**
**شاخ مێزەری بەفری بەست**
**خوتبەی سەربەرزی هەڵبەست**
**ڕیزی بە دەستە گوڵ بەست**
**بولبول بانگی هەڵ داوە**
**سەیرانکەر کەوتنە جەولان**
**بە بەرگی ڕەنگی گوڵان**
**زەردو سوور ئاڵ و والان**
**دەستەگوڵی بەستراوە**
**گۆرانی سەیران کەران**
**دەنگی بولبول لە داران**
**خرنگەی پۆیلەداران**
**بە ئاهەنگ تێکەڵاوە**
**هەورە تریشقەو باران**
**کوتوپڕ هەڵ پڕونگان**
**هەم پێکەنین هەم گریان**
**هەر بۆ بەهار لواوە**
**بەهەشتی جاویدانی**
**گەر ئەیدیوەو نایزانی**
**بە هەشتی سلێمانی**
**بنوارە لە پێش چاوە**
**ئەو ئەرخەوانە جوانە**
**کە بە گردی سەیوانە**
**سەیری کە ئەو کچانە**
**وەك قومری دەوریان داوە**
**گردی یارە دیارە**
**جێ تەجەلی دلدارە**
**خوڵی ئەو نوورو ناوە**
**کلی کەنووری چاوە**
**ئەو کارێزی شەریفە**
**کە مەڵبەندی زەریفە**
**ئاوی ڕوون و لەتیفە**
**بە چۆپی کێژان داوە**
**بۆ ئەم خاکە وەك دڵسۆز**
**ئاگرم تێبەربوو بەسۆز**
**ناوم نا ئاگری نەورۆز**
**لەدڵما داپۆشراوە»**

کاتێ لە ژمـارە ـ ٦٢٢ ـ ی ڕۆژنـامـەکەدا شیعرەکە بلاوبوەوە، نجـم الـدیـن مەلا ـ لە ژمـارە ـ ٦٢٣ ـ دا بەم نووسـینـە

سەرنج ڕاکێشە ساغی کردەوە کە - عزت محی الدین - پیرەمێردی نەمرە!

«بێ کاری»

ئاخ لە دەس بێ کاری، تووشی دەردێکی کردوم کە بە هەموو بیرمەوە تێ بینی لە ژیانم ئەکەم، تێی ناگەم؟ نازانم خەوە یامەستی یە؟! نازانم بیرە یا ڕاستی یە؟! نازانم هەر لەبەر خومەوە ئەبزرکێنم! وەنەوز ئەدەم، چاکیشە شێت نابم! خۆ ئەگەر بێت و گوێتان لەدەم و دوانم بێت هەر شێت ئەبن، ئەوە بۆ نایەن گوێ لەم چەند وتەیەم بگرن؟ ئەڵێم، ئەی باوکی ژین و ژیان، زیندووکەرەوەی زمانی کوردستان، پیرەمێرد گیان، سوپاستان نایەنمە پایان، وە هیوای مانتان ئەخوازم لەیەزدان، لە ڕۆژنامەی - ٦٢٢ - دا هۆنراوەیەکی بەهاری زۆر جوان و نایابم دی لەوانەیە هەر لە تۆبوەشێتەوە، کەچی بەناوی یەکێکی تر نووسرابوو، بەڵێ ڕاستە، بە هەڵە نەچووم، کە چوومە بنج وبناوانی ئەم ئیشەوە زانیم خۆتی، لەمە زۆر دڵگران بووم، چونکە ئاساری تۆمان لەوانەی یەکێکی تر بۆ جیاناکرێتەوە [بێ سارانی]، وەلی دیوانەو دەباشانی و کێ وکێ؟! خۆت ئاگاداری لە سلێمانی لە کونجێکی تەنیایی دا سەرنووسەرێکی نرخداری ژیری کورد کە بە - نجم الدین - ناوبانگە دارەو لەلای من بە - نجم الأدب - ئەزانرێ ژیانی خۆی کردوتە، تەرخان - وقف - ی ئەدەبی کوردی بەتایبەتی کۆمەڵە هۆنراوەیێ ڕێك بخەی بەناوی یەکێکی واوە بینووسی ئەی - نجم الأدب - بە ناوی کێ وە بینوسێ؟! خوم هۆشەنگە - یش ئەیەوێ کە مێژووی ئەدەبی هەموو کوردستان بنوسێتەوە، ئایا ئەگەر هۆنراوەیەکی جوانی وای دی ئەوچی بکا؟! ئەو ئیشە ئەبێتە هۆی پەلەوپۆ وشك کردنی ئەدەبی کوردی ساوای تازە سەرپێ کەوتو! . وەکو ئەو نەورۆزنامەی کە لە دووسێ ژینی لەمەوپێش دا دیمان کە بەبێ ناو نووسرابوو!! ئایا بە کێی دابنێین؟ کێ وەکو من خوا گرتویەتی وەك سەگی پێ سووتاو سەرئەکەم بە هەموو کونێکاو لەپاش هەزار چەرمەسەری زانیم کە - مهندس - ی ئەشغالی سلێمانی - حکمت أفندی - وتویە! بەڵام ئاخ لەدەست چەند کەسێك کە ئەو واجبات وشروط انە پێویستە لە هونەرا بێ لەوانا نی یەو لە خۆیانەوە دەستیان داوەتە هۆنراوە وتن، ئەگەر ڕۆژگار یاریدەمان بدا دەست ئەکەینە - تحلیل - کردنی - شخصی - ئەوجۆرە کەسانەو ئەیان هێنینە بەرچاوی خوێندەواران. ئەمە وائەزانم ئەم نووسینەی کە نووسیم بەدەمم زیادە بەڵام - وتە - کە هاتە سەرهەق کردنی چاکەو دیارە .

تۆش ئەگەر بم زانی لێم ناگری، هەرچەند کە ناشم زانی هەر لێم ناگری چونکە لەناو کوردەواری دا باوە ئەڵێن - شێخ و مشایخ دوورو نزیکیان بۆ نی یە، هەروەها ناسیاو و نەناسیاویان بۆ نی یە -، تۆش [شێخ و مشایخ]ی، بەخوا زۆر وتەم ماوە بۆ جارێکی تر، ئیتر هیوام لێ بووردنە، هیوام نووسینی ئەم نووسراوەیە، هیوام بەجێ هێنانی نووسراوەکانمە، هیوام . . . ].

- بێ کار -

وەلامی پیرەمێرد لە هەمان ژمارەدا : -

«کۆنەپیاوەکان کاتی تی تیروکەوان وتویانە، تیر ئەهاون و کەوان ئەشارنەوە! تۆیش تیر ئەهاوی، کەوان ئەشاریتەوە، ناوی خۆت گۆڕیوە! خەڵك شیعر ئەدزن، من خۆم دزیوە!!، تۆ ئەو کورەی کە بە شوێن - زەرگەتەیی - دا چوویتە کۆنە کەلاوەکەی زەرگەتە! تۆ - نجم الدین مەلا - ی لەمەڕ من و وێڵی ئەدەب و ئەدەبیاتی کوردی، منیش زیندویان ئەکەمەوە، لە چاپیان ئەدەم، لەسایەی خواو خاکەکەمەوە، ئەم خاکە ڕووناکە ئەمەندەی شاعیر تیابووە هێندەی - کلمات ربی - ئەگەر دەریاش بێ بە مەرەکەب بە نووسینی ناگات .

سەرچاوەکان : -

---

١ - ڕۆژنامەی ژین - ژمارە - ٦٠٤ - ئابی ١٩٤٠

# تەنیایی لە چەند نموونەیەکی شیعریدا

**نووسینی رەزا سەیدگول بەرزنجی**

لەو کاتەوە کە ئادەمی لە دایك بووە لەگەڵیدا خوشی و ناخوشی بو بووەو قەرەبەقەرەی رویشتووە ئاشکراشە نەخوشی لە سەردە لەنەخوشی . هی وا هەیە لە روژیکدا تووشی هەردووکیان دەبی . ئەگەر ناخوشی و تالی و سویری نەبایە کەس تامی خوشی نەدەزانی .

لە چەرخی ئیستاشماندا (تەکنەلوجیا) لە زور رووەوە پیشکەوتنی بو ئادەمی داهیناوە بەلام لەگەڵ ئەمەشدا نەتوانراوە ئازارو ئەشکەنجەی لی دووربخاتەوە . ئەو ناخوشیانەی کە تووشی ئادەمی دەبیت و هەستی پی دەکات (تەنیایی)ە، کە ئازارو سفت وسویەکی دەروونی تایبەتی هەیە . وەنەبی تەنیایی بە بەردەوامی لەگەڵ ئادەمی دابیت بەلکو لای هەندیك پتر بەردەوامی دەبیت و دەبیتە هوگری وەکو لای هەندیکی تر .

ئەو هویانەش کە وا لە ئادەمی دەکات هەست بە تەنیایی بکات ئەمانەیە :

**یەکەم: دوورکەوتنەوەو دابران لە کەس وکارو، خوشەویست .**

**دووەم: مردنی کەسانی خالی یەکەم (مەبەستم ئەو کەسانەیە** کە شوینی تایبەتیان لە دلی تووشبووەکەدا هەبیت) .

سی یەم : لە ولات دوورکەوتنەوە (لیرەشدا مەبەستم غەریبی - یەکە نی یە بەلکو بەهوی ئەوەوە هەست بە تەنیایی دەکری) .

چوارەم : جوری وا هەیە هیچ یەك لەم خالانەی باسم کرد رووی نەداوە. کەچی لەکەل خوتدا هەست بە تەنیایی دەکەی .

دووری یە خالی تریش نەبیت؟ بەلام من ئەوەندەم دەست نیشان کرد (دەروون ناسەکان) دەتوانن چاکتر دەرکی پی بەرن چونکە نیشی ئەوانە .

ئینجا هەر کەسیك کە تووشی بوو بە تووشی تەنیایی یەوە (مەبەستم هەستی تەنیایی یە) ، لەبەر هەر هویەکیان بیت هەر وەختیك هویەکە لەناو چوو ئەم هەست بە تەنیایی یەکەش دەرواو نامینی ، بارودوخی دەروونی کەسەکەش دەگەریتەوە دوخی جارانی .

کەسیش نی یە هەست یان تووشی تەنیایی نەهاتبی و نەبیەت . بەلام تەنیایی لای شاعیران ئاوا بە سووك و ئاسانی نایەو بروات ، بەلکو تووشی ئازاریکی دەروونیان دەکات دەبیتە هەوینی سەر هەلدانی شیعریك یان لە شیعرەکانیانە رەنگ دەداتەوەو. ئازارەکانیان لە ناو وشەکاندا دەتاوینەوەو رەنگ وورووی وشەکاندا سەرهەلدەدەن .

ئەوەتانی (نالی) شاعیر دەلی :

**لیباسم ماتەمی و شینە لە شین دام**(۱)
**سریشکم سوورو رەنگم زەردە بی تو**
**عەزیزم دل رەقە خوم فەردو تەنیام**
**دەترسم بمکوژی ئەم دەردە بی تو .**

شاعیر کە وشەی (بی تو) لە دیرەکاندا دووبارە دەکاتەوە هاوارو نالەنالیتی لە دەست دەردی کە خوی لە خویدا تەنیایی دەگەیەنی و ورەی پی بەرداوەو لە خەفەتا جلی ماتەمی تازیەداری پوشیوە . (نالی) لە دەست تەنیایی دا تووشی گەلی دەردی دەروون هاتووە ، دلی وەك کەباب سووتاوە . . نەفەسی تەنگ بووە . . رەنگی زەرد هەلگەراوە .

(نالی) کە ئوستادی شیعر بووە ئوستادی گریانیش بووە بەوەی کە لە دەست تەنیایی فرمیسکی خویناوی رشتووەو ئەوەندە .گریاوە چاوەکانی بوونەتە گومی خوین . لەمە ترساوە کە بە دیداری (ئەو) شاد نەبیت و (تەنیاتی) بیکوژ ی .

(بیکەسی) شاعیریش لە شیعرە بەناو بانگەکەیدا (ئەی مانگ) پەنا دەباتە بەر مانگ کە هەردووکیان تووشی یەك دەرد هاتوون ، ئەمیان لەسەر عەرز عاجزو تەنیایە ئەویش (مانگ) لە ئاسماندا ویل و سەرگەردانە کە دەلی :

**ئەخیلتم ئەی مانگ قیبلەی دلداران**(۲)
**دەرمانی دەردی دلەی بیماران**
**شەویکەو ئەمشەو بگەرە فریام**
**بی یارو هاودەم عاجزو تەنیام**

شاعیر خوی دەخیلی مانگ دەکات کە بە ئاسمانەوە بیت فریای کەویت و ببیتە هاودەم و هاوری ی لە تەنیایی رزگاری کات . مانگ کە هاودەمی دلدارانە شەوان کە بەتەنی دەمیننەوە دەکەونە رازو گفت وگو، ئارامی یەك . . فینکی یەك بەدلی پر سویان دەدا . . ئینجا شاعیر دەلی هەر ئیمشەوە بگەرە فریام دەستم بگرەو لەم تەنیاییەدا دەرم بینە . . دیارە بەرگەی تەنیایی ناگری و یان بەگران لەسەری دەکەویتەوە . خالید دلیری شاعیریش لەم پارچەیەیدا ئاوا خوی داوەتە دەست کە دەلی :

**جوانی سرنجی وا راکێشابووم**[3]
**هەر وەك فریشتە**
**خۆی ئەنواند، منێك کە وا تەنیا بووم**
**بردمی لە خشتە**

لێرەدا دەبینین تەنیایی شاعیرو جوانی شۆخێك کاریان کردوتە سەر دەروونی شاعیر. وەکو بیەوێ بلێ لە خشتە بردنەکە بە دەستە خۆم نەبووەو سووچی تەنیایی بووە بەم بەزمەی گەیاندووم.

صلاح شوانی شاعیریش دەبێتە شوانی هەورو دەبێتە باران و دەلێ:

**جێم مەهێلە**
**بارانم و، بۆ هەر کوێ بڕۆی**[4]
**ئەتوانم لێوی غەریبی‌و**
**نوێنی تەنیاییت بۆ ئاوڕشێن کەم**
**جێم مەهێلە.**

شاعیر بە شێوەیەکی کە دەیەوێ خۆی لە دەست هەستی تەنیایی رزگار کات بەوەی بە خۆشەویستەکەی دەلێ بارانم بۆ هەر کوێ بڕویت لە دواتم بۆیە (جێم مەهێلە)، چۆن باران تینوویەتی زەوی دەشکێنێ ئاوا منیش وەکو باران بە سەرتەوە دەبم لەگەڵتدا دێم ئاوڕشێنت دەکەم بەردەوامیت پێ دەدەم تەنیاییت دەشکێنم، چونکە باش دەزانێ کە نەیەلی دڵدارەکەی بڕوات خۆشی تووشی تەنیایی نایەت، ئەگەر هەردووکیشیان بەیەکەوە بن ڕەواندنەوەی تەنیایی‌یە بۆیە دەلێ (جێم مەهێلە).

(أحمد هەردی) شاعیریش رازی خۆی لە دەست تەنیایی‌دا دەدرکێنێ کە چۆن چرای ئاواتی کوژاوەتەوەو تووشی ئازاری دەروون.. تاسان.. هیلاکی بووە کە دەلێ:

**لە تەنیایی شەوی ژینا، ئەنێم هەنگاوی کوێرانە؟**[5]
**نی‌یە دەستێ، دەرمبێنێ لەناو ئەم گۆرە وێرانە**
**نی‌یە جوانێ، سەری کاسم، بنێمە سەر دڵی نەرمی!**
**کە هیلاکی لەشم دەرکا، خەوی سەر باوەشی گەرمی**
**ئەگێرم چاوی بێ‌تینم، بە تاریکی شەوا، سەرسام**
**نی‌یە پرشنگی دوو چاوێ، کە رووناکی بکا، رێگام..!**
**بە غەیری باڵی غەمناکی،**
**شەوی پڕ ترس و سامناکی،**
**نی‌یە یەك تۆزە رووناکی!**

شاعیر لە تەنیایی‌دا تووشی گەلێ دەرد هاتووە، وەکو یەکێك لەناو تەنیایی‌دا توابێتەوە وایە، چونکە ئەوەندە کارامانە باسی دەکات. هەنگاوەکانی لێ تێك چووەو کوێرانە هەنگاو دەنێ، چاوەڕوانی دەستێ.. جوانی دەکات

بێتە فریاکەری، وەك فریشتە لەناو گۆری تەنیایی بیهێنێتە دەرێ‌و هیلاکی لەشی پێ دەرکا، لە باوەشی گەرمی بحەسێتەوە

هەر چ هیواو رووناکی هەشبووە لەناو تاریکی شەوا دەتوێتەوەو بە غەیری غەمناکی باڵی بۆ کردوتەوە شتێکی کە نابینێ.

بەهەرحاڵ (تەنیایی) هەستێکی دەروونی‌یەو ئازارو سەخت و سۆیەکی تایبەتیشی هەیە، وە لەم چەند نموونە شیعری‌یەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە چۆن شاعیرەکانمان کاتێ هەستیان بە تەنیایی کردووە تووشی چ حالەتێکی دەروونی هاتوونەو ئەمەش لە شیعرەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە. ڕەنگ دانەوەی

ئەمانیش ڕەنگ دانەوەی من و تۆو ئەوانی تریشە، چونکە حاڵەتێك نی‌یە، تایبەت بێ بە شاعیران و بەس.

لە کۆتایی‌دا دەڵێم هەویری تەنیایی گەلێك لەمە زیاتر ئاو هەڵدەگرێ‌و دنیایەکی گەلێ لەمە فراوانترە کە تەنیا بەم چەند نموونانە مەبەست بپێکی‌و کۆتایی بێنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیـوادارم شتێکم کردبێ یا بەلایەنی کەمەوە گومەکەم شلەقاندبێ‌و خامەی شارەزا تر قۆڵی لێ هەڵماڵی‌و گۆمەکەمان بۆ روونتر کاتەوە، دیسان دەڵێمەوە نموونەی تری شیعری زۆرمان هەنە بەڵام تەنیا بۆ مەبەست چەنگم لەمەندەیان گیرکرد.

•

## سەرچاوە شیعری‌یەکان


١ ـ دیـوانـی نالـی وفەرهـەنـگی نالی د. معـروف خەزنەدار ل ٩٠ ٢ ـ دیوانی بێکەس ل ١٠٣
٣ ـ ئاگروکول ل ٣١
٤ ـ دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەك نی‌یە (صلاح شوان) ل ١٢٦
٥ ـ رازی تەنیایی (ئەحمەد هەردی) ل ٧٩ ـ ٨٠
٦ ـ دیوانی مەولەوی مەلا عبدالکریم ل ٢٤٩



# خەملاندنی بەسەنایەتی و دەنگی نوێ کردنەوە لە وەرزی شیعری «بەختیار زێوەر»دا

● محەممەد عەزیز مەلا رەحیم ●

مەسەلەی لێدوان و کوڵینەوە لەشیعری نوێ بەنیازی تاوو توێ کردنی لایەنە بنچینەیی‌یەکان و گەڕان و سەر لێ دەرکردنی هەروا شتێکی ئاسان نی‌یە. بەڵکو بابەتێکی سەر دەمی‌ی ئەوتۆیە کە بەبێ لایەنی‌و بە ویژدانەوە متمانە بکرێتە سەر ناوەرۆك و پشت بەستن بە نوێ کردنەوەو ڕێبازی نوێ کردنەوە.

بۆیە وای بەباش دەزانم هەر لە سەرەتاوە قۆناغی شیعری دەست پێ کردنی (بەختیار زێوەر) دەست نیشان بکەم، کە لە قۆناغی سەرەتای شیعر دانانی دا پەیڕەو کارێکی قوتابخانەی (کلاسیك)بووەو بە چێژو خرۆشی ئەم قوتابخانەیە یەکەم کۆرپەی شیعری چاوی بەبەهرەی دنیای شیعری هەڵێناوە.

ئەویش دیارە ئەگەڕێتەوە بۆ مەست بوونی دەروون و جۆش دانی ئاغی بەبەرهەمی شاعیرانی کوردی بەر لە خۆی، کەپەیڕەوی ئەم جۆرە ڕێبازەیان کردووە. هەروەها بۆ تێگەیشتن و چۆنیەتی بارو دۆخی شیعری کوردی لەو سەر دەمەداو شارەزابوون لەو چاووگە خۆڕسکی یانەکە ئەستوونی ڕەشماڵی شیعری کلاسیکی کوردی‌یان لەسەر هەڵساوە:

حاوی بازی هەر بە چاوبازی خەریکی فیتنەیە
لەعلی لێویشی ئەزانم وەك مەیی سەرشارمە
حەز ئەکەم تیرسەیری چاوی کەم بەڵام مورغی دڵم
دێتە لەرزە وپێم ئەڵێ هاوار ئەوەشمەقارمە

ئەم دوو دێڕە نموونەیەکن لەوپارچە غەزەلەی شاعیر تیای‌دا پەیڕەوی کلاسیکی یانەی کردووە وەك دەست پێ کردنێکی سەرەتایی. شیعرەکە ... لە سەریەکێ لە کێشەکانی (هەروز)چنراوە، ئەویش کێشی (...)ە لەرووی ڕەوان پێژیشەوە، ووشە سازی‌و ووردەکاری ڕەگەز دۆزی (جیناس)ی تیا کراوە لەنێوان ووشەی (باز)دا کە جاری یەکەم ناو ... بۆ وەسفی چاوو، جاری دووەم بە (کردار)بۆ چاو لە نێوە دێڕی ... دا بەکار هێنراوە.

گە ... ی داڕشتن و حاڵەتە دەروونی‌یە بابەتێکی جوانی پەرستانەی شیعری کلاسیکی‌یە. کە وەك تاقی کردنەوە بۆ پتەوکردنی بناغەی کۆشکی شیعری‌ی ئەم چەشنە شێوازە بە بەرهەمی زوربەی شاعیرانی قۆناغی نوێ کردنەوەوەدیارە. بەم چەشنە (بەختیار زێوەر) لەم بابەتە چەپکێ شیعری تەڕو پاراوی چنیوە، کە وەك سەردەم نیشانێکی مێژوویی قۆناغی دەست پێ کردنی شیعرێتی. وەك ڕێبازیش خۆبەستەوەیەکی ڕاستەوخۆیە بەگیانی پەروەردەکراوی شاعیرێتی یەوە بۆ جم وجۆڵی گۆڕانی تازەگەری لە کەرەسەی شیعردا شان بەشانی شێوەو سیماکانی تری ڕەوان پێژی بەنیازی بوژانەوەو نوێ کردنەوە لە شیعری کوردی‌دا دوایە دوای ئەو نموونەیەو چەندین نموونەی تر کە لەسەر کار تێکردنی قۆناغی کلاسیکی بەسەر سەرەتاو دەست پێکردنی تەمەنی شیعری‌ی شاعیرەوەیە. لە دیوانەکەی دا شیعری (بەستەی جوتیار)، بەڵگەیەکی ڕاستەقینەی ئەو هەوڵ وکۆششەی شاعیرە لە بواری ئەو سەردەمەدا، کە بەسەر گەرمی یەوە لەژێر زەبری نوێ خوازی و خولیای دا هێنان دا ئەم هەنگاوەی نابێ. لەم شیعرەدا بیری سەربەست و دەربڕینی هونەرمەندانەی خۆی دەردەبڕی لەزمانی جووتیارێکەوە لەژێر کاری سەلیقەو ئەرکی شاعیرانەی خۆی‌دا کەوەك بایەخ دان بەگرنگی فرمانی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ لەو سەردەمەدا هەڵساوە بە پوچ کردنەوەی بیرو بڕوای نەخشەکێشراوی ئەو کەسانەی هەردەم بە چاوی هەل پەرستی‌و، بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانەوە سەیری ووڵات و ساماني بە پیتی ووڵاتیان کردووە. ئەوەتا بە دەنگێکی ڕاستی پڕلە گیانی هۆشمەندایەتی یەوە لە جووتیارێکەوە خۆبەستەوەی مرۆڤ بە خۆشەویستی زەوی‌و ووڵاتەوە نیشان ئەدات، هەروەها ئەوهەژاندنە نوێ خوازی‌یە وەك واتایەکی سەردەم بە چینایەتی‌یەوە ئاوێتە دەکات و، ژیلە مۆی دژایەتی خۆی لە کورەی قاڵ بووی شیعرەکەدا ئەکات بە گەرووی (مەرویەگە وسەرمایەدار)دا. ئەم هەوێن و بابەتە بە پێزانەی لەم شیعرەدا ڕەچاو دەکەوێ ئەوە دەست نیشان دەکەن کە شاعیر لە جۆشی ئەفتێنەو سۆزی کلاسیکی‌یەوە هەنگاوێکی گەورەی بۆ (ڕیالیزمی چینایەتی)ناوە، کە ئەویش گۆڕدانێکە لە هێزی شیعری‌دا بەرەو ڕیالیزمی شۆڕشگێڕ:

ئەم زنجەی خۆم ناگۆڕمەوە بەتەلار
نان و دۆی خۆم نادەم بەخوانی زۆردار
داسی خۆم نانێم لەگەردنی هەژار
هێزی شان و قۆڵم نادەم بە بێگار
من سەربەستم ،ئێش بەدەستم، زۆر بە کار
من جوتیارم، من جوتیارم، من جوتیار
کێڵگەی وولاٽ بۆ میرو بەگ ناکێڵم
بشم کوژن زەوی خۆم جێ ناهێڵم
تۆو ئەوەشێنم ئاڵتونە شوێن هێڵم
زۆردار واز دێنێ بسکەی دێ سمێڵم
گەنم و جۆی خۆم نادەم بیکەن بەعەمار
گرانی پێ سازبکەن سەرمایەدار
بێخەم ئەبم لەو خاوەنی سامانە
کە بوژانەوەی ئێمەی لا گرانە
لەسەر ڕەنجی ئێمەش خاوەن دیوانە
هەقی ئەو نەوعە کوشتن و زیندانە
چونکە چاو برسیو خوێن مژە نالەبار
لەسەر شانی گەلی هەژار بوتەبار .

پاش ئەم شیعرە، واتە شیعری(بەستەی جوتیار) لە دیوانە کەدا شیعری (ووتاری کوردێك)، شێوازێکی داهێنەرانەو جوانکاری هونەرمەندانەی تری (بەختیار زێوەر)ە لە شیعرەکانی دا، کە سەرکەوتوانە دەسەڵاتێکی شاعیرانەی پێوە دیارە لە هەڵبژاردنی ووشەو وێنەی ڕەسەنی مرۆڤانەدا. ڕستە بە دارشتنی بە برشت لە چنینێکی ئەندازە بەدەر، بە شەقڵ و سیمای ئەم شیعرەوە دیارە. ئەمیش وای کردووە هەر تەواو ناوەڕۆکێکی بەرز بە بالای خۆی دا بکاو ئاوازێکی شۆرشگێرانەو خوێن گەرمی یەکی بەبەهرانە لەسروشتی هەستە خاوێن و مرۆڤایەتی یەکەی شاعیرەوە هەڵبقوڵێنێ.
شاعیری هۆشیار هەمیشە دڵسۆزی گەلەو، بە چاوی ڕاستەقینەوە دەڕوانێتە ئاسۆڕو ئازارەکانی سەردەم. ئەوڕاستی یەشی لە بەرچاوە، کە دەنگی زوڵاڵ و نەرەی مافی ڕەوای جەماوەر لەژێر تارمایی هەوڵ وکۆششی کۆنە پەرستانەدا سەرنگوم ناکرێ. جالێرەدا خۆبەستنەوەی شاعیر بە دژو دژایەتی یەوە تیشکدانەوەی ئەو بەگژ یەکاچوونی چینایەتی یەیە، کە بەپێی سەردەم و هەڵگۆڕانەکان هەنگاو دەنێ تالە کە لێنێکەوە خۆری بەختیاری ئەوچینە بەدی بکات . بەم شێوەیە شاعیر پێشڕەوەو دەنگدانەوەی دەنگی ڕاپەڕیوی میللەتە، ئەوێ ئەیەوێو دەری ئەبڕێ لە پێناوی بوون و،چەسپاندنی بوونی ئەواندایە:

یابۆ زۆرداران بچەوسێمەوە
بالە بێگاریان ئەحەسێمەوە
شپرزە نابم هەڵ ئەسێمەوە
چونکە تا مردن
پێ دروکردن
بە ڕزی وولاٽم
بوتە ئاواتم
نامەوێ بژی کۆنەپەرستی
ئاو ئەدەم بە خوێن گوڵی سەربەستی
پێم قوت نادرێ دیلیو ژێردەستی
بە دەنگی دلێر
وەکو بێچوە شێر
هاوار ئەکەم من
بڕوخێ دوژمن

بەم پێیە (بەختیار زێوەر)، لەگیانی تازەکردنەوەوە ڕێبازێکی هونەری گەورەو، بزوتنەوەیەکی ئایدۆلۆجیانەی بنیات ناوە، کە پێویست بە تو یژینەوەیەکی هێجگار بەرفراوان ئەکات وەك کەرەسەیەکی زانست بتوانرێ ئەم لایەنە گرنگە لەشیعری کوردی دا ساغ بکرێتەوە.
ئەم شێوازەش ئەوە دەسەلمێنێ، کە هەوڵی ئەو، بڕیارێکی زانستی ئەدەبیانە بووە بۆ ڕەگە داکوتاندنی بیری نوێ خوازیو چەسپاندنی لە زەمینەی شیعرەکانیدا. چونکە ئەو سەرەنجامانە بەبێ مشت ومڕ دووپات کەرەوەی ئەو ڕاستی یەن، کە ئەم شاعیرەمان لەو سەردەمەدا ڕابەرێکی بوژێنەرەوەی ڕێبازی چینایەتیو، بەرپاکردنی ئەم جوڵانەوەیەبووە لە شیعری کوردیدا.

•

خەملاندنی ئاسۆی ڕۆشنبیریو، پەرەسەندنی لە بەرهەمی هەر شاعیرێکدا ووریایی‌وهۆشمەندی ئەو شاعیرەیە دەربارەی بیروڕای بنەڕەتی هۆنینەوەو، ئەو ئاوە خنە بەهێزانەی بەردی بناغەی بەرهەمی شیعری لەسەر هەڵدەچنرێ.

شیعری (پاییزیو زستانی)، بەلگەیەکی دیارن بۆ ئەم سەرنجەم و توانیویانە نموونەیەکی تری تەواو خۆمانەوکردن وشاکارێکی بلیمەتانەی شاعیرانە بدەن بەدەستەوە. کە ئاشکرایە لە ڕووی شێوەو ناوەڕۆکی شیعرەوە، بە شیعرێکی واتا بە پێزو، بە بەر هەمێکی نەمر دەدرێتە خامە.

ئەوەی منی ڕاکێشا بەلای شی کردنەوەی دانان و سۆراغی سەرچاوەکانی ئەم شیعرەدا، یەکەمیان : بەکارهێنانی ووشەی کوردی ڕەسەنی خۆماڵی یە کە بەپێی ئەو سەردەمە بەدەگمەن شاعیران خۆیان لەبواری ئەم ڕێچکەیەئەدا. دووەمیان : تێ هەلکێش کردنی ئەو مەبەست و بۆچوونە مەزنەیە شان بە شانی شێوەو دارشتنی گشتی شیعرەکە، کە شاعیر

توانیویتی لەسەر پەردەی شیعرەوە سەرگوروشتەی کوڵ نەدانی مرۆڤانەو سروشتی پاك و خاوێنی نیشتمانەکەی نیشان بدات دژ بە دژوارێتی نالەباری پایزی بێهیواو زستانی بەربەست ، کەوەك هێما دەست نیشان

کردنێکی ئارام گری‌و نە بەردانەیەلە بەردەم ئەو بەرهەلست کارانەی قوت دەبنەوە لە ئاست کاروانی هەوڵ وکۆششی ژیان و، ڕەوتی بەدی هێنانی خەونی سەوزی گەلەکەی‌دا.

بەم جۆرە (بەختیار زێوەر)وەك شاعیرێ، ئەو ئەرکەی لەسەر شانی بووە چ لە ڕووی تازە کردنەوەو چ لە ڕووی بە تین کردنی واتاوە لە بەرهەمەکانی دا نکولی لەشیعرو، سامانی ئەدەبیمان نەکردووە. بگرە

وەك ئەندامێکی کارامە شوێن هێڵی خزمەتی خۆی کەوتووەو، لاری لەم بوارەدا نەبووەو ، ئەوەی پێویست بووە بەوپەڕی ئەمەکی‌و دلسۆزی‌یەوە ئاراستەی کۆمەڵ و ئەدەبەکەی کردووە :

وا گەلا ڕێزانە گیانە بۆ چیمە نزار
هاژە هاژی بای خەزانە ڕوبە ڕوی شار
ئەو درەختانەی کە سەریان زۆر بلندە
ئەو گولانەی ڕەنگە و بۆیان زۆر پەسەندە
ئەو مەلانەی جێگەیان کاوو سەهەندە
هاتنی پایز لەبەر دلیان گرانە
چونکە توندی و گرڕژو مۆنی پرجیهانە

* * *

پایزی زەرد بابە عێوان کاری وابێ
بگرە لامان خۆشە زستان بەفرو (با)بێ
ئەوکەسەی سەرسامە لێمان دلنیابێ
جەستە خۆشەی مەینەت و دلْ هەلکزاوین
بەم کەژوکێوانە سەربەرزی تەواوین
بۆ سەرەو ژوورکەی هیوا خێرا بەتاوین
بەفرو باری ئێمە ناگرێ تاکو ماوین
چونکە هەولی ئێمە بۆبەرزی ژیانە
چوست و خوێنە گەرمین و دلمان شادمانە
تیر بیاری کردو کۆشمان بێ ووچانە

ئەگەر چی دروست بوونی هەندێ جیاوازی لەم دوو بەشە شیعری‌یەدا خستبیە ئەو هەلوێستەوە ، بلێم لەکاتی نووسینەوەی دیوانەکەدا لێ‌یان پەڕێنرا بێ، یان تەواوکردنی مەبەست لەلایەن شاعیرەوە خرابێتە سەریان ئەویش بەوەی لەبەشی یەکەم دا : دێرە (موستەزاد)ەکە لە دوو نیوە دێر پێکهاتوە، کەچی لەبەشی دووەمم دا : لەسێ نیوە دێر. هەروەها لە بەشی یەکەم دا دێرەکانی دوای دێرە موستەزادەکان ژمارەیان پێنج نیوە دێرە، کەچی لەبەشی دووەم دا ژمارەیان حەوت نیوە دێرە.

بەلام لەگەڵ ئەوەش دا لەڕووی ئەنجام بە دەست هێناتەوە، گەوهەری واتای لە دەریای بۆچوونی شاعیرانەدا وون نەکردووەو ، لەم بارەیەوە کەم وکوڕی تیا بەدی ناکرێ.

سەرکەوتن و بە پێزی شیعر لەو وێنە دلگیرو دەربڕینە بە سۆزانەوە ئەبێ کە تاقی کردنەوەو لایەنی ڕەسەنا یەتی لە دەروونی شاعیرەوە نەخشە دەکێشن.

جا ئەگەر ئەو وێنە دلگیرو دەربڕینە بە سۆزە لە کاسەی زەبری ڕووداوێکی مێژوویی یەوە سەر هەلبدا ، ئەوائەو شیعرەی ئەم دوو خالە دەگرێتە خۆی دیاردەیەکی فەلسەفی دروست ئەکات لەنێوان یەکگرتنی بابەت و ئەو ڕواڵەتەی وەك کەرەسە دەنگە و ڕەنگی شیعری دەگرێتە خۆی.

کە وابوو(بەهەشتێکی‌وون بوو)، کەهۆی بزوتن و جولەی لەدایك بوونی شیعرەکە (بوومە لەرزەکەی پێنجوێن)ە، لە قالبێکی تری هونەری دایەو شێوازێکی جیاوازە لە شیعرەکانی پێشوو، بەوەی کەزیاتر ڕووی لە ڕیالیزم ناوەو کارەساتەکانیش ڕووداون وەك لەوەی ئەندێشە، تابلۆی وێنەکانی تیا بنە خشێنێ . ئەمەجگە لەوەی دیوارێکی جیاکار لەنێوان ڕیالیزم و کلاسیك دا هەلدەچنێ بەوەی کارەساتەکانی ئەم شیعرە ڕاستن‌و دوورن لە شێوەی پیاهەلدان بە پێچەوانەی کلاسیك، کە ئەفسانە پیا هەلدان زمانی گێڕانەوەی ڕووداوەکانێتی:

ئەو چەمە نزارەی هەوارگەی ئێمە بوو
واپەپووتیایا ئەخوێنێ پڕ بەبین
ئەو مرۆڤانە لەوێ بوون شادمان
ئاوەکی کەوتوون و بێ‌بەخت و نگین
بەم بەرەو جەژنانە ماڵ وێران هەژار
نابە دڵ ناچار هەموویان دەرپەڕین

که بەمە وەك ڕۆشنبیرێکی ڕاستەقینە لە قوتابخانەی کۆمەڵەوە ویستویتی پلەوپایەی زانستی وکاری مەزندەیی فێرکاری بەلای(مامۆستا)داو زامی بێ نەزانینی کۆمەڵی کوردەواری لەوقۆناخەدا بەرابەر بەم ئەرکە پەروەردەیی یە ، نیشان بدات و لە ئەنجامیش دا ، وەك چارەسەرکردنێکی بلیمەتانەی داهێنەر، خاڵی کۆتایی دروست کارانەی شیعرە ڕەخنەیی یەکەی بێت:

بەڵام سەد ئاخ ئەوەمان ناتەواوە
لای کورد هێشتا قەدرت باش نەزانراوە
ڕۆژێك ئەبێ قەدرت بگرن بەچاوان
لەبەر دەمتا بوەستن تیپی لاوان
هەیکەلێکت بۆ بکەن گشتی ئاڵتون
گوڵ بارانی بکەن بەشەوقی دەروون

بەم جۆرە چرۆی بیرێکی مرۆڤانەی هاوچەرخ بەدی دەکرێت بە درەختی بەرهەم داری شیعرەکانی یەوە . ئەگەر بەسەنگە وترازووی ئەمرۆ، کێشی ڕاستەقینەی خۆی بدرێتێ، بەرهەمێکی ڕەنگینی ئەوکارانە نەمرەی ئەدەبی کوردیمانە کەلە کورەی قاڵبووی نوێ کردنەوەوە ، چەندین پشکۆی پێشەوایی گەشاوەتەوە .

ئەو شیعرانەی کەلەو دیوانە دەست نووسەدا بەرچاو دەکەون ، لە هەرسێ لایەنەکەوە( چەشەی ئەدەبیو ڕواڵەت و دیوی ناوەوەی شیعرەکان)بە بەر هەمێکی شاکارو زیندووی بەپێت دەژمێررێن .

هەڵبەتە ئەوی دەیڵێم لە سەرچاوە ڕوون و بنەڕەتیەکەوە، پەنجەی دەخەمە سەر بێ ئەوەی تاقانەمەبەستم، گەورەکردنی قەوارەو زەمینەی شیعری (بەختیار زێوەر)بێت ، کە ئەم لێ کۆڵینەوەو بە سەرکردنەوەیە سەلمێنەرێکی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی شاعیرە دەرهەق بەجیهانی شیعری کوردی، پێشکەشی کردووە .

(بەختیار زێوەر)لە گیانی وێنەکێشیو چێژی هونەر مەندانەی شاعیری خۆیەوە، توانی گەلێ بەرهەمی بەسوودو ڕەونەقدار وەك گوڵ دەستە ئاراستەی ئەو سەردەمەو ئەمرۆی شیعری کوردیمان بکات . کەلە بایەخی ئەدەبیکی تەواو خەملێوو ئەو بارە ڕێبازە فەلسەفی یەوە سەری هەڵدا ، وەك هەڵچوونێکی تامەزرۆیی ڕۆژ بەڕۆژ لە جۆشی کوڵ و سەرگەرمی دەنگدانەوەدایە .

تێ بینی :

● ئەو کەسەی دیوانە دەست نووسەکەی بۆ هێنام، هاورێم کاك (مەحمود زێوەر)بوو ، کەبرای (بەختیار زێوەر)ی شاعیرە .

● لەدیوانەکەدا گەلێ نموونەی شیعری ڕۆمانسی هەن، کە بەنەمام لە دەرفەتێکدا لەگەڵ هەندێ شیعری ڕۆمانسی شاعیرانی تردا لێ کۆڵینەوەیەکی بەرفراوانیان لەسەر سازبکەم .

ئەم جۆرە دڵسۆزی و لاواندنەوەیە ئەوە دەگەیەنن . کە شاعیر دڵدارێکی ڕاستەقینەی خۆشەویستی گەلەکەی بووەو ، وەك کلاوڕۆژنە سەرچاوەیەکی ڕووناکی بووە بۆ تیشك خستنە سەر ڕۆژی ڕەش و ، شڵەقاندنی گۆمی مەنگی چارەنووسی میللەتەکەی لەو قۆناخەدا . ئەمەش گەلێ مۆرکی ڕۆشنبیریو بەهرەی بەهێزی شاعیری بە ناوەرۆك و ڕووخساری شیعرەکانی یەوە دەرخستووە . کەوەك درەختێ لە ناخی(بەختیار زێوەر)دا لە پەل هاویشتن و نەش و نماکردنی هەتاهەتایی دا بوون و بەردەوام بەرهەمی خۆیان لەوەرزی ڕەخساوی پێگەیشتن دا پێشکەش کردووە .

بەم پێو دانە مەسەلەی خۆشەویستیو، دەربڕینی عەشقی سەوداسەری خۆبەستنەوە بەلای نیشتمان دا بڵێسەی ئاگرێکی هەمیشەیی بووە لە گیانی شاعیردا، کە هیچ هێزێکی کارێ کراو پەی بەکوژاندنەوەیان نەبردووە .

جا ئەگەر تا ئێستا ئەو نموونانەی دراون بەدەستەوە لەسەر هەڵچوون و داچوونی یەگرژ یەکا چوونی چینایەتیو ، نیشاندانی وێنەی لاواندنەوەی کارەسات بووبێ . پێم وایە شیعری(مامۆستا گیان)ڕێگایەکی ترو شێوەیەکی تر دەگرێتە بەر لەڕووی هەڵماڵینی پەردەی ئاشکرابوون بۆچوونە ناو قوڵایی پلەی ژیریو ئاستی تێگەیشتن لە بەردەم شێواز یکدا ، کە تەواو شاعیر تیایە ژیرانەگەیشتۆتەئەنجامێکی پرشنگدار لەڕووی ڕەخنەو کاری یەکالاکردنەوەی زانستانەدا :

مامۆستا گیان، تۆپێشە وای جوانانی
چرای ڕووناکی خاکی کوردستانی
لە نیشتمانا سەر کردەی زانستیت
بنچینە دانەری قەڵای سەربەستیت

لەڕەخنە سازیدا دەرخستنی خەوش و دۆزینەوەی ڕێگەی چارەسەرکردنی دیاردەیەکی چەرخی ئەمرۆیە، کە ڕەخنەگر بتوانێ لە خاڵی دەست پێ کردنەوە ئەنجامێکی دروست کەری بۆ بسازێنی لە ئاوو هەوایەکی لە بارداو ئەوی بێپەردە ئاراستەی بابەتەکەی بکات . لەم ڕووەوە ڕەخنەگر پزیشکێکی کۆمەلایەتی یەو دەیەوێ کەم وکوڕی کۆمەڵ وەك نەخۆشی نەتەنێتەوەو ، ڕێگەیەکی گونجاو بۆ ئەو نەخۆشی یە دەست نیشان بکات .

بۆیە(بەختیار زێوەر)لەگەر لەپاڵ شاعیر یشدا ڕەخنەگر بووبێ هیچ جێگەی سەرسوڕماندن نییە، چونکە ئەو کەم و کوڕیو هەلانەی تێبینی کردووە، ویستویتی بێ شەرم وشکۆ لەشیعرا ئاشکرایان بکات و لە هەمان کاتیشدا ئەنجامێکی ڕۆشن کەرەوەیان لەبری بۆ دەست نیشان بکات .

# ڕەسوڵ هەمزاتوڤ

# پەیامنێری داغستانە

جووتیار توفیق

ڕیگای نێوان شاری مەحەج قەلاو گوندی تسادا ڕێگایەکی تەسکی پیچاوپیچە. بەهەندێك شویندا زەحمەتە دوو ئۆتۆمبیل بتوانن بەشانی یەکترا برۆن[1] نیوانی ئەوشاروگوندە بەئۆتۆمبیل دە سەعات دەبێ. ناو بەناو خەلکی گوندی تساداو گوندەکانی دەوروپشتی ڕیگایەکی دووروودرێژ دەبڕن وبەو ڕیگا سەختەدا. بەئۆتۆمبیل بێ یان بەولاخ بەرەوپیری دۆستیکی شیرینی خۆیان دەچن؛ هەرکە پیشی گەیشتن دەیکەنە چەپلە کوتان و هەڵپەڕکێ، پاشان هەمووپیکەوە بەدەم گورانی چرینەوە بەرەو گوندی تسادا دەگەڕینەوە. ئا بەم جورە خەڵکی تساداو گوندەکانی دەوروبەری پیشوازیی شاعیری میللی ناسراو، پەیامنیری داغستان ڕەسوڵ هەمزاتوڤ دەکەن.

ڕەسوڵ هەمزاتوڤ شاعیرێکی ناوداری داغستان و سوڤیتە، لە سالی (١٩٥١)ەوە کراوەتە سەروکی یەکیتی نووسەرانی داغستان، لەکونگرەی هەشتەمی نووسەرانی سوڤیتیشدا کەلەم دوایی یانەدا بەسترا بەسکرتیری یەکیتی نووسەرانی سوڤیت هەلبژیردرا، هەروەها ئەندامیکی کاری یەکیتی نووسەرانی ئاسیاو ئەفریقییە، هەتاکو ئیستا چەندین خەلاتی سەنگین و بەنرخی جیهانی پی بەخشراوە.

ڕەسول هەمزاتوڤ کوری شاعیری میللی داگستان «هەمزە تسادا ...»یە، لە ٢٨ی ئەیلولی ١٩٢٣دا لەگوندی تسادا هاتوتە جیهانەوە. خویندنی سەرەتایی تەواو کردو چووە قوتابخانەی پەروەرەیی پیشەیی، پاشان چووە پەیمانگای ئەدەبیاتی گورکی لەشاری موسکو، پێنج سال لەو پەیمانگایەدا خویندی، سالی (١٩٥٠) پەپلەی ئیمتیاز تەواوی کرد.

ئەگەرچی هەمزاتوڤ بەرەچەلەك ئاڤاری یە[2] بەلام وەك نوینەری تەواوی گەلانی داغستان ناسراوەو لەقەبی شاعیری گەلانی دغستانی پی دراوە؛ خوی لەوبارەیەوە وتویەتی «چارەنووس بمباتە هەر ولاتیك، من خوم بەنوینەری ئەوخاك و شاخ وگوندە دەزانم کە یەکەم جار لەوی فیرە ئەسپ زین کردن بووم. لەهەر کوی بم خوم بەپەیامنیری داگستانەکەم دادەنیم[3]، یان دەلی: «داگستان زەویمە، نەریتم، چیامە، دەریامە، داگستان؛ ئەی نیشتمانەکەم... دانی پیدا دەنیم کەتو بیروهوش و هەستمیت، سەرم لە پەنجا ولات زیاتر داوە، هەمیشە داگستان بەخاك وخەلکی یەوە لەگەلمدا بووە». هەمزاتوڤ تەنها لەچوارچیوەی داغستیان داگیر ناخوات بەلکو لەسنووری داگستان وسوڤیتیش دەردەپەڕی و دەربارەی مەسەلە جیهانی یە گرنگەکانیش دەدوێت ولەسەر گەلانی ژێردەستەو زەحمەتکیشی جیهان هەلدەداتی، چونکە

ئەو مرۆ دۆستەو هەموو نەتەوەیەکی خۆش دەوی و بەچاویکی پر ریزو شکۆوە دەروانیتە گەلانی جیهان، ئەوەتا بۆخۆی دەڵی: «مە شاعیریکی ئاڤارم. لەگەڵ ئەمەشدا نەك تەنیا هەر هەستی لی پرسینەوەی ئاڤارو سەراپای داگستان و هەموو وڵاتەکەمانم لەدڵدایە، بەڵکو هی هەموو دونیام لەدڵدایە. ئەمە سەدەی بیستەمە. پیاو وانەبی ناژی».

سەرەتای شیعر نووسینی هەمزاتوڤ هی ئەو دەمەیەکە هیشتا لە قوتابخانەی سەرەتایی دا دەیخویند. خوی دەڵی: «لە خیزانی شاعیردا لەدایك بووم و پەروەردەکرام، زوو دەستم بە شیعر نووسین کرد. تەمەنم نەگەیشتبووە بیست ساڵ وەختیك یەکەمین کتیبم بەزمانی ئاڤاری دەرکرد» وەختیکیش چووە پەیمانگای ئەدەبیاتی گورگی دەروازەیەکی گەورە لەبەردەمیدا ئاواڵە بوو، ئەودەم شیعرەکانی کامل ترو رازاوەتر بوون و مۆرکی تایبەتی یان وەخووەگرت. لەماوەی پینج ساڵ خویندنی لەو پەیمانگایەدا شارەزایی یەکی باشی لەشیعری جیهانیدا پەیداکرد، گەلیك شاعیری ناسراوی سوڤیتی لەنزیکەوە ناسی و گەلیك شاعیری ناوداری جیهانیشی لەدوورەوە ناسی.

لە ساڵی (١٩٣٧)ەوە دەستی کردووە بەبڵاوکردنەوەی بەرهەمە شیعری یەکانی، یەکەمین دیوانی شیعری بەناوی «ئەوینیکی بەهیزو رقیکی بەتین»ەوە لە ١٩٤٣دا بڵاوکردەوە. لەو دیوانەیدا هەست و ئازارو سوی دڵی بەرامبەر رۆژگارە سەخت و دژوارەکانی جەنگی جیهانی دووەم دەربری، هەروەها سکاڵای دڵی خوی لەو جەنگە ناهەموارەکرد کە بووە هوی لەناوبردنی هەزاران لاو کە یەکیکیان برایەکی خوی بوو. پاش ئەو دیوانە گەلیکی دیکەشی بڵاوکردەوە، لەوانە: ساڵیك کە تییدا لەدایك بووم (١٩٥٠)، ئەستیرە بڵندەکان (١٩٦٢)، سنوور (١٩٧٤)، ئەفسانەکان (١٩٧٥)، لەبەردەم ماڵەوەدا (١٩٧٨)، پەیڤی شاعیر (١٩٧٩)، دوورگەی ئافرەتان (١٩٨٢)و گەلیکی دیکەش[٦].

یەکەمین بەرهەمی پەخشانی رەسوڵ هەمزاتوڤ کتیبی «داگستان نیشتمانمە» یە کە ساڵی ١٩٦٧ بەرگی یەکەمی لی بڵاوکردەوە، دوا بەدوای ئەویش بەرگی دووەمی بڵاوکردەوە، ئیستاش بەرگی سی هەمی بەدەستەوەیە[٧] ئەم کتیبەی دەری خست کە ئەکەر توانای پەخشان نووسینی لەشیعری زیاترو بەرزتر نەبی کەمتر نی یە.

هەمزاتوڤ لەکتیبی «داگستان نیشتمانمە»دا هەوڵی داوە نیشتمانەکەی بەخاك و خەڵکی یەوە بەخوینەر بناسینیت و خوینەر بەگەیەنیتە لایەنی ژیانی گەلانی داگستان ئاشنا بکا. بەشیوازیکی ئەوتونە داگستان دەدوی کە خوینەر زوو بەئاسانی ئەو زانیاری یانە وەربگریت و چیژ لە خویندنەوەی وەربگری، دەربارەی: خۆشەویستی، ئازایی، زیرەکی و دڵسۆزی و گەلیك بابەتی دیکەی نووسیوە، بۆ هەر بابەتیکیش لەدانە چەندین ئەفسانەو چیرۆکی میللی و سەرگوزشتەو بیرەوەری خوی گیراوەتەوە. هەروەها دەربارەی کەسە میژوویی یە ناسراوەکانی وڵاتەکەی نووسیوەو پیی یانیدا هەڵداوە. بەسەرهاتەکانی ژیانیانی گیراوەتەوەو باسی ئازایی و جوامیری یانی کردووە. بە دەربارەی کەسیتی و رەفتاری هەریەکەیانی نووسیوەو باسی دانایی و هوشمەندی یانی کردووەو وتە دانسقەکانی ئەوانەی بەبەکانی کردووە. شامیل و ئەبوتالیب و جەمسەدینی و هەمزەتسداساو گەلیکی تر وەیاد دینیتەوەو بەخوینەریان دەناسینی.

ئەو کەسە گیانبازو لەخوبوردوانە وەیاد دینیتەوەو دەسەری دەنووسی کە لەریگای گەل و نیشتمان و لەپیناوی سەرجەم مروڤایەتی دا تیکوشاون و گیانی خویان بەخشیوە[٨].

رەسول هەمزاتوڤ لەم ژیانەدا زیاتر لەهەر بابەتیك گرنگی بەمروڤ و خاك دەدات: مروڤ بەلایەوە بەرزترین و بەنرختترین شتی سەر زەمینە. لەمروڤ رامیتی و سایکولوژی یانە بەناخی دا رودەچی، بەوردی و بەشیوازیکی ناسك و جوان دەربارەی کەسیتی و رەفتارو بیری مروڤ دەنووسیت. لەچاوپیکەوتنیکدا «ماجد سامەرایی» ساڵی ١٩٧٨، لی پرسی:

- تو لەتەواوی نووسینەکانتدا روو دەکەیتە مروڤ... دەشیت ئەوە بەکورتی دەرببری کەویستوتە بەمروڤی بنی؟

رەسول هەمزاتوڤ وەڵامی دایەوە:

-... من ئەویندارو مروڤم، بەبی مروڤ هەڵناکەم. بەبی مروڤی دی من مروڤ نیم... دەبی شاعیران دروشمی «دوستایەتی مروڤ» بکەن دروشمیان، بەبی ئەم

دۆستایەتی یە مەحاڵە دۆستایەتی نێوان گەلان وەدی بێ[8].

هەروەهـا بایـەخ بەخـاك دەدات چونكـە پێی وایـە مرۆڤ ئەویندار هۆگری ئەو خاكە دەبێ كە گوزەرانی لەسەر دەكات و ناتوانێ لێ جیا ببێتەوە.

بەشێـوازێكی فەلسـەفی یانە ئەو پەیوەندی یە ئاشكرا دەكات كە مرۆڤ بەخـاكـەكـەیـەوە دەبـەستێتـەوە، چەنـدین چیـرۆكی فۆلكلۆری ئەفسانەو سەرگوزشەو پەندی پێشینان و بیرەوەری دێنێتـەوە بۆخـاتـری ئەوەی ەهـۆیـانەوە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خاكەكەی بخاتە ڕوو.

هەمـزاتـۆڤ لەنـاو باڵنـدە جۆراوجـۆرەكـانـدا تەنهـا هەڵـۆ سـەرنجی ڕادەكێشێ و لەهـەمـوان زیاتری خۆش دەوێ، لای ئەو هەڵـۆ نرخ وبـەهـایەكی تری هەیە لەچاو باڵندەكانی تردا. لەگـەڵێك نووسینی دا دەربـارەی هەڵـوی نووسیـوە، تەنـانـەت كارگـەیشتـۆتـە ئەورادەیـەی چەنـدجـارێك لەوڕووەوە ڕەخنەی لێ گیـراوەو وتـراوە: « ڕەسـوڵ هەمـزاتـۆڤ زۆر باسی هەڵـۆ دەكـات!»، ئەو بۆخـۆی وەڵام دەداتـەوە: « ئاخر من چی بكەم كەهـەڵـۆ لەگشت باڵنـدەكـانی تـر سەرنجم زیاتر ڕادەكێشێ. . هەڵۆ ئازاو بەهێـزە . . دوورتـرو بـەرزتـر دەفرێت. . . دەنگی ساف وبـەرزە. . هەرگیـز وڵات و شوێنی خۆی جێ نـاهێڵێ ئەگـەرچی زریـان و سەرماو سۆڵەش بێت. . شوێنی لووتكەی بەرزە، لەجێ بڵنددا نەبێ هێلانە ناكات»[9].

بەلای هەمـزاتـۆڤـەوە شاعیـری ڕاستەقینە ئەوكەسەیە كەتەواوی شیعـرو نووسینـەكـانی بۆخزمـەتی كۆمـەڵـەكـەی و مرۆڤایەتی بێ، بەلایەوە دەبێ شاعیر كەسێكی كۆمەڵایەتی و هەشمەند، ڕاستی بێژ و چاونـەتـرس بێ. لەچـاوپێكـەوتنێكـدا كە گۆڤـاری سەنگین و پێشگـەوتنخوازی «لوتس» بلاوی كـردۆتـەوە، لەوەڵامی پرسیـكـدا وتـویـەتی: «شـاعیـر وەكـو شاهیـدێك لەبـەرەمی دادگای گەورەی مێژوودا ڕادەگیرێ. شاهیدیش پێویستە ڕاستی بڵێ، تەنهاراستی، ئەگینـا دووچـاری سزا دەبێ. شاعیریش ئەگەر شاهیدی بەدرۆدا، شزاكەی سەخت دەبێ و لەشاعیریش دەگەوێ مردنیش مـوگەر دەبێ»[10]. یان لەچـاوپێكـەوتنێكی تری ئەو گۆڤـارەدا لەوەڵامی پرسێكـدا وتـویەتی: «شاعیر هەمیشە ڕێبوارە، بۆئەوەی نەكەوێتە ناو شیـوێكـەوە، وە بۆئەوەی كەخـۆی لەكـوڵانێكی گیراودا نەبینێتەوە، دەبێ تەنهـا بەوە دانـەكـەوێ كەسـەیـری بەرپێی خۆی بكا، بەڵكو جارجـار ئاورێـك بۆدواوەش بداتــەوە، چونكـە لە ڕابـووردووەوە ڕۆشنـایی دەڕژێتـەوە: ڕۆشنـایی مێـژوو، ڕۆشنـایی سـەدەكـانی پێشـوو. . . شاعیـر ڕابـووردووودەبـەستێتـەوە بەئەمڕۆوە، ئەمڕۆش بەدوارۆژەوە، پاراستنی ئاشتی لەسـەر ئەم زەوی یـە كەڕابـوردووو ئێستاو داهاتوومانی لەسەر بەند مایەی بایەخ پێدانمانە»[11].

ڕەسـوڵ هەمزاتۆڤ مرۆڤێكی قۆشمەو ڕووخۆش، خاكی وسادە، ڕوح سووك و هێمن و سەروزمـان شیـریـنە (كیم شۆلوخۆف) جوانی بۆچووە كە وتـویـەی: «هـەمیشە لە ژیانیدا دەم بەپێكەنینە، حەزی لەنـوكتـەو سەرگـووزشتـەو پەنـدی میللی یە. . . هەركاتێك لەبـەردەمی جەمـاوەردا شیعـر بخـوێنێتـەوە تاوێـك نوكتەو چیرۆكی سەیرو سەمەرش دەگێڕێتەوە»[12].

پەراوێزەكان:

(1) تسـادا: گونـدێكی حەفتـا ماڵـەیـە، ڕەسـوڵ هەمزاتۆڤ لەوێ لەدایك بووە.

(2) داغستـان: كۆمـارێكی ئۆتـۆنـۆمی یـە، كەوتـوتـە سەروی خۆرهەڵاتی قەفقاس

(3) ئاڤـار: گەلێكـە لە گەلـەكـانی داغستان، (لەوڵاتی داغستاندا وێـرای گەلی ئاڤـار، لەك و لیـزگینی و دارجینی و كۆمیكی و چەنـد گەلێكی دیكەش هەن).

(4) داغستـانی من، كتێبی یـەكـەم، وەرگێـرانی عەزیـزگـەردی، 1979، ل 30.

(5) رسـول حكـزاتـوف، اكتب في وقت واحد عدة اشياء، مجلة «لوتس»، العدد 61، 1987، ص 174.

(6) مجلة (آفـاق عربيـة)، حوار مع الشـاعـر السـوفيتي رسـول حمـزاتـوف، العـدد السـدس، السنـة الثـالثـةعشرة، حزيـران 1988، ص 127.

(7) مامـۆستـای هێـژا عەزیـزگـەردی، دوویـەرگی یەكـەم وئەم كتێبـەی(بـەكـوردی یـەكی پاراووجوان) وەرگێـراوە بۆكوردی و بەناوی «داغستانی من» ەوە بلاوی كردۆتەوە.

(8) مجلة (الاداب البيرتية)، العدد 6، حزيران 1980، ص 3.

(9) داغستانی من، كتێبی دووەم، 1985، ل 84.

(10) مجلة (لوتس) العدد 61، ص 168.

(11) رسـول بريـد لداغـستان، مع رسول حمزاتوف، عدد خاص (1987)، ص 161.

(12) كيمسولوفوف، رسولحمزاتوف: بخم بلادنا، لوتس، العدد 62، 1987، ص 182.

# گارسیا لۆرکا ...

وەرگێڕانی لە ئیتالییەوە

پاشینی ئەمی سەعی ١٩٨٥ ـ ئیتالیا

«ژیان و چەند نموونەیەکی شیعرەکانی . . . »

## وکرۆنۆلۆجیای ژیان و بەرهەمەکانی :

## بەشی یەکەم: - ژیانی «لۆرکا»ی شاعیرو هونەرمەند .

لە ساڵی ـ ١٨٩٨

لە ـ ٥ ـی حوزەیران دا، فیدریکۆ گارسیا لۆرکا ـ Federico Farsia Lorca ـ لە ناوچەیەکی نزیک شاری گرانادا ـ Granada ـ ی ئیسپانیا لە دایک بووە. سەرەتای منداڵیی لە ناوەش گوندەکانی دەشتی گرانادا بەسەربردووە، لۆرکا زۆر دڵسۆزانە سەرنجی دیمەن و دیمەنەکانی گوندەکەی ئەدا و دەروونی داپڕاستووە. ئەو سروشتە پڕجوانییە بووە هەوێنی یەکەمین شیعری، بۆیە هەتا مردنیش، جوتیاران و گوندەکان و چۆڵ و چەم و ماڵ و مەڕوماڵات و درەختە باڵابەرزەکانی ئەو گوندەی هەر لەبەرچاو بوو، لەیادی نەدەچوونەوە.

١٦٠٨ : لە «ئالمیریا ـ Almeria» دەستی کرد بە خوێندن، بەڵام هەر زوو لەخۆشییەک بەرەو ماڵەوەی بردەوەو لە خوێندن پچڕ.

١٦١٤ : ئیتر خوێندنی خوێزی «ئاداب»ی هەبوو، بەڵام لە پێناوی زیاتر فێربوونی دا، لە خوێنێژی «حقوق» دەستی کرد بە خوێندن. حەزی ڕاستەقینەی خۆی «موسیقا» بوو، دایکی زۆری بۆ ئەرکەش کردبوو، سەرەتا دایکی و پورە ئیزابێل ـ Isabel ـ ی بوونە مامۆستای و فێری ئیدانی - ئیتر- یان کرد، پاشان لەژێر چاودێری «دون ئەنتونیو سیکورا ـ Don Antanuo Segura »دا فیری لیدانی «پیانو» و «دارشتنی موسیقی بوو.

١٩١٦ : لەگەڵ «مارتین دومینکویز بیرویتە ـ Berrueta » چەند سەفـەریکی [ئـارکیـولـوجی] دەکـات بـۆ ئـەنـدەلـوسیـا ـ Andalusia »، لە شاری «بـایـزە ـ Baeza »، «ئەنتونیو مەچادو ـ Machado » دەناسیت.

١٩١٧ : لە شوبـاتی ئەم ساڵـەدا، ووتاریکی بەناونیشانی «بۆ چوونـە رەمزییەکان»، ەوە لە بلاوکراوەی «مەلبەندی هونەری گرانادا »بلاوکردەوە، بەبۆنەی یادی سەدساڵەی لەدایك بوونی [« زوریللا ١٨١٧ ـ ١٨٩٣ » ]وە، ئەمـە یەکەمین بەرهەمی دەست و دلی لورکـایـە کە بلاوکـرابیتـەوە. هاوڕێیەتی یەکی توونـد لەگـەڵ موسیقـاران [مـانـویـك دی فالیە ـ DeFalla ]دا دەبەستی، بەم بونـەوە لەپەیوەندییەکانی نیوان موسیقاو شیعر بەقوولی شارەزا دەبیت، هاوڕێیەتی لەگەڵ [فیرناردو دی هوس ریوس ـ De los - Rios ]دا دەبەستی و بە بیروباوەڕی [سوشیال ـ لیبیرال] دەهەژی.

ووتـارەکـانی لە گوفـارەکانی ئەو سـەردەمەی گرانادا، وەك [ لیـتـــراس ـ letras ] و [دی بورگـــوس De Borgos ]دا بلاودەکریتەوە، لەم ساڵەدا چەند سەفەریك بەناو ئیسپانیادا دەکات.

١٩١٨ : یەکەمین بەرهەمی شیعری بلاودەکاتەوە بە ناونیشانی [ئینتیبـاعـات و گوێـدەکـان] [یادداشتی دەشت و شیعرەکانی جوێەنی ئەناو ئیسپانیادا ].

١٩١٩ : دەچێت بۆ [مـــەدریـد ـ Madrid ]، دەبێـتە هاوڕێی قوتـابی یە شۆڕشگێڕ و ڕاپەڕیوەکانی ڕانکو بەناییەنی [ئەبیزنی، گویین، سالیناس، دیێگـۆ، سەنفـدور دانی] لە گوڤاری [نوی کردنەوە ـ Hinovacion ]دا یەکەمین شیعری بلاودەکاتەوە.

١٩٢٠ : لە ٢٢ی مارت دا، یەکـەمین بەرهـەمی شانـۆیی لە شاری مەدریـد لەسـەر شانۆی [ئیسـلاڤا ـ Eslava ] پیش کەش دەکـات، ئەم هەنگـاوە لورکـا تووشی گەوەن و بیـــزاربـوون دەکـات و لە یەك ڕۆژ زیـاتـر پیش کەش ناکـریت، بۆیـە هەنـامـردن بلاوکـردنـەوەو چاپ کردنی ئەم شانـۆگـەرییـەی حەرام کرد. ناونیشـانی شانۆگەرییەکە « بێ ناوانی پەپوولە» بوو.

١٩٢١ : لـە ٥ی حوزەیـران دا، یەکەمین ناميلکەی شیعری

بلاودەکاتەوە بە ناونیشانی ]کتێبی شیعر ـ Libro de Poemas ] .

١٩٢٢ : بەشداری فیستیڤالی «گورانی یە فوونەکان ـ gondo » دەکات کە «دی ڤالله» ساری کردبوو، هەروەها لە دەرچوونی گوڤاری «ئاسو ـ Horizonte » دا هاریکاری دەکات .

١٩٢٣ : لەگەل «دی ڤالله» لە ئێوارەی ـ ٥ ـ ی کانوونی یەکەمدا، جەژنی بو منداڵان ساردەکەن لە شاری گرانادا، هەرلەم ساڵەدا کولێژ ی «حقوق» تەواو دەکات .

١٩٢٤ کەلەسەروسینی دیوان شیعری یەکەی کە ناوی «گورانی یەکان»ە دەبێتەوە، دەست دەکات بە نووسینی «روماں نووسە فەرەجەکە» «

١٩٢٥ شانوگەری «Mariana Pineda » دەنووسی و لە مالی «سەلڤادور دالی» دەیخوێنێتەوە .

١٩٢٦ : کوریکی شیعر خوێندنەوەی لەلایەن [ خوێنین ]ەوە بو ساردەکرێت لە ئەکادیمیای «Valladolid » .

١٩٢٧ : دیوان شیعری یەکەی «گورانی یەکان ـ Canciones » لە [ مالاگـ ـ Malaga ] چاپ دەکرێت، ـ گورانی یەکان ـ سەرجەمی ئەو شیعرانەن کە لورکا لە ساڵانی [ ١٩٢١ هەتا ١٩٢٤ ] نووسیویەتی . لەمانگی تشرینی یەکەم دا شانوگەری «Mariana Pineda » لەسەر شانوی [ فونتالبا ـ Fontalba »ی مەدرید پیش کەش دەکات، لە کانوونی یەکەم دا دەعوەت دەکرێت بو مەکسیک لەلایەن [ Sanchez Magias ]ی هاوڕێی یەوە، بە بەسەرکردنی «خوێنین»و «ئەنبیرفی» .

١٩٢٨ : گوڤاری «Gallo » دەردەکات، تەنها دووژمارەی ی دەردەچێ . لە گوڤاری ئەموردا . زمان نووسە فەرەجەکە . لە گوڤاری «De Occidente » دا بلاودەکاتەوە . ئەم دیوانە شیعری یە، سەرجەمی شیعرەکانی سانی [ ١٩٢٤ هەتا ١٩٢٧ ]ی لورکا دەگرێتە خوی .

١٩٢٩ : وەك موبیبی یەك، دەچیتە زانکوی ـ کولومبیا ـ لە شاری نیویورك ـ دەبێتە هاوڕێی « Leon Fexp »، بەموسیقای ـ gass ـ سەرسام دەبێت و شارەکەش هانی دەدا زور بە «سوریالیستانە» »، نامیلکە شیعریك بەناونیشانی [شاعیریك لە «یورکەی نوی ـ Pota en Nueva York ] بنووسی .

١٩٣٠ : دەچیتە کوبا، بەسوێن بەرهەمە فولکلورییەکان دا دەگەڕێ، بەکوتایی ئەم سالەدا دەگەڕێتەوە بو ئیسپانیا . . .

١٦٣١ : دیوانە شیعریك بەناونیشانی « شیعر بو گورانی یە فولـەکان ـ IL Poma del gondo » بلاودەکاتەوە، پروژەیەك دەست پی دەکات بو دروست کردنی تیپێکی شانویی گەڕوك .

پاش ساڵێك تیپی شانویی ـ La Barraca ـ ی گەڕوك دادەمەزرێنی .

١٩٣٢ : چالاکی هونەری ئەم تیپە لەلایەن دەزگەی دەستەی رژیمە مونارکی یەکەی ئیسپانیاوە بەرەنگاری دەکرا، شانوگەری «شایی خوێناوی» لەم ساڵەدا نووسی و پاش ساڵێك لەسەر شانوی«Beatriz » پیش کەشی کرد .

١٩٣٣ : لەمەکسیك دیوانێکی شیعری بە ناونیشانی «Oda a Walt Whitman » چاپ دەکرێت، لەمانگی ئەیلول دا بەرەو ئەمەریکای خوارووسەفەر دەکات، دەچێتە [ ئەرجەنتین و ئوروگوای و بەرازیل و]، چەندین چاوپیکەوتنی لەگەل دا، کوری شیعرخوێندنەوەی بو ساردەکەن، شانوگەری یەکانی پیش کەش دەکرێت، لەلایەن خەلکەوە بەگەرمی پیشوازی دەکرێت، ناوبانگی جەماوەری زور پەیدادەکات .

١٩٣٤ لەمانگی مارتی ئەم ساڵەدا، دێتەوە بو وولاتەکەی خوی، ئیسپانیا لە گەردەلوولی چەندین ناخوشی و مەرگەساتدا دەبیت، لە ١١ ی ئاب دا «Sanchez Megias »ی هاوڕێی لە یاری زورانبازی دا» دا دەمرێت، خوشەویستی ئەم هاوڕێی ئازیزەی شکڕێکی پی دەنووسی بە ناونیشانی «شیوەنی بو «Llanto Por I.S. Megias ـ Sanchez Megras » ـ کە دیوانێکی شیعری یە .

١٩٣٥ شانوگەری «مالەکەی بیرناردا ئالبا ـ La Casa de Bernarda Alba » دەنووسی، کەهەردەمی ی بەرهەم هێنراوی بارو زروفی خوێناوی ئەو سەردەمەوەیە . لەمانگی کانوونی یەکەم دا، سەرەتای شانوگەری «ئافرەتی کولاوی ـ Dona Rosita » دەنووسی .

١٩٣٦ لە ١٢ی ئەموزدا، بەهوی کوشتنی [ کالوسوتیرو ـ Calo Sotero » ی سەرۆکی بەرەی راست رەوەکان ]ەوە، ئیسپانیا بەتەواوەتی دەهەژی ـ لورکاش وەك دوستێکی نزیکی بەرەی چەپڕەو ـ دوستایەتی یەك کەبەهوی ئەدەب و هونەرەوە پێو ویێو بووبوو، هەرئەمەش بوە هوی ئەوەی لورکا جەماوەرێکی زوری هەبێت و لە بواری شیعرو شانودا لە لوتکەی سەرکەوتن دا ناوبانگی بلاو ببێت ـ لە ١٧ ی ئاب دا دەبوو بەرەو مەکسیك سەفەر بکات، دەی ویست مناوایی لە باوکی بکات و ئەوجا ئیسپانیا بەجی بێلێ، دەبینی باوکی لەلایەن

لە - حیسبەکانی - Falangisti - ەوە گیراوە، بۆ سووراغی بوونی سەفەرەکەی دوادەخات، پاش دووڕۆژ لە ١٩ی ئاب، لە [ڤیزنار - Viznar] لەلایەن دارودەستەی چەپەیی زرێمەوە، لە نەوەرەکەی - لورکا - بەردەست ڕیزی لوولە دەدرێت. لورکا تەنیا [٢٨] ساڵی ژیاوە، بەڵام لە حەقیقەتدا بەرهەم و نووسینەکانی تەمەنی زۆرتر بوون، لەخۆشی لەمرترن...

● شیعرەکان، وێنەکان، گۆرانییەکان، چاوپێکەوتنەکان، نامەکان، وسەرتاپای نووسین پەرش وبڵاوەکانی لیو کۆفارو ڕۆژنامە جیاوازو دووروریکەکان، ئەمانە هەموو هێدی هێدی کۆکراونەتەوەو لە بەرگێک دا بەناونیشانی «سەرجەمی بەرهەمەکان» چاپ کراون. سەرەتا [ئارتورودێل هویو - Arturo Del Hoyo] بەم کارە هەستاوسال بەدوای سال، ئەستوورترو دەوڵەمەندتر دەبوو، لە ساڵی ١٩٧٤دا گەیشتە هەژدەهەمین چاپ لەدوو بەرگ دا...

*** 

پەراوێزەکان: - [*] - ئەم گورەیەی زیان و بەرهەمەکانی [لورکا]، بەرمانی ئیتالی لەپێشەکی، کتێبی شیعرەکەی نووسراوە، کە [کلاودیو ڕێندینە - Claudio Rendina] کردوویەتی بە ئیتالی - ساڵی ١٩٧٠ - لەلایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی [NEWTON COMPTON EDITORI] یەوەچاپ کراوە. - ئەمانە لەچاپی - ١٩٧٤ی سەرچاوەی ناوبراوەوە وەرگیراوە، لەلاپەرەکانی [١٣ هەتا ١٨]، سەرچاوەکە نامیلکەیەکی قەوارە مام ناوەندی [١٩٠] لاپەرەییە. [هێندەی پەیوەندی بە شیعرەکانەوە هەبێت، لە پەراوێزی تایبەتی شیعرەکاندا باسم کردووە، بۆزیاتر ڕوون کردنەوەو نووسینەوەی ئەم پەراوێزە کەلکم لە [ئینسیکلۆپیدیای - ئەدەب] - و [قاموسی زاراوە ئەدەبییەکان] وەرگرتووە]. ئەمەش ناوی سەرچاوەکەیە بە ئەنیتالی و بەئیسپانی: -

[ئیتالییەکە GARCIA LORCA POESIE - Ciandio Rendina

ئیسپانییەکە LIBRO DE POEMAS - Garua Lorca].

١ - کرۆنۆلۆجیا - Cronologia - واتە: ڕیزکردنی ڕووداوو بابەتەکانی شتێک بەپێی کات و سەردەمی لەدایک بوونیان، کردنی زنجیرەیەک، ئەمە چ لەلایەنی مێژوویی یەوەبێت، چ لەلایەنی گرنگی مەسەلەکانەوە بێت.

٢ - ئارکیۆلۆجیا - Archeologia - توێژینەوەیەکی زانستیانەی شارستانییەتێکی کۆن لەرێگای ئەدەب و هونەرو بەرهەمەکانی ئەو کۆمەڵ و شارستانییەتەوە.

٣ - زۆریلا - Zorrilla ١٨١٧ - ١٨٩٣ - شاعیرێکی گەورەی ئیسپانی بووە، خاوەنی زیاد لە [٣٠] دراماو ژمارەیەکی زۆر لە نامیلکەی شیعری و یاداشت و ئەفسانەیە.

٤ - ● [ئەلبیرتی] ناوی - Rafael Alberti - بووە، ساڵی ١٩٠٢ لەدایک بووە یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی ئیسپانیا، وەک لورکا ئەویش خەڵکی [ئەندەلوس] بووە.

● [گویلین - ناوی - gorge Guillen] بووە، ساڵی ١٨٩٣ لەدایک بووە، شاعیرێکی ئیسپانییە.

● [سالیناس - ناوی - Pedo Salinas - ە، [١٨٩١ - ١٩٥١] شاعیرێکی ئیسپانی بووە.

● [دیێگو - ناوی - Gerardo Diego - یە، ساڵی ١٨٩٦ لەدایک بووە شاعیرو ڕووناک بیری ئیسپانییە، دامەزرێنەری بزوتنەوە - Creazionism - واتە - داهێنان - ە، بزوتنەوەیەکی زۆر نزیکە لە [سووریالیزم] و [فتووریزم]ەوە.

● دالی - ناوی - Salvador Dali بووە، هونەرمەندێکی بەشێوەی زۆر بەناوبانگی ئیسپانییە. ساڵی ١٩٠٤ لە [کەتەلۆنیا]ی ئیسپانیا لەدایک بووە.

٥ - ڕۆمان نووسە قەرەجەکە - ناونیشانی ئەم دیوانە شیعرییە، بە ئیسپانی ئەمەیە «Romancero gitano» ووشەی - gitano - بەوقەرەجانە دەوترێ کە لە ناوچەکانی خواروو و ڕۆژهەڵاتی ئیسپانیادا دەژین. لەبەرئەوە، لەکوردییەکەدا وام بەباش زانی کە هەر ووشەی [قەرەج بنووسرێت. ئەمەش مەبەستی سەرەکی [لورکا] بووە.

٦ - ماریانا پینیدا - Mariana Pineda - لەدەقە ئیتالییەکەدا، هەر بەشێوەی ناونیشانە ئیسپانییەکە نووسراوەتەوە، منیش بەباشم زانی هەر ناوە ڕەسەنەکەی خۆی بهێڵمەوە بێ وەرگێڕان - واتەکەی - - مریەمی پاک - دەکەیەنی.

٧ - سوریالیزم - Surrealism بزوتنەوەیەکی هونەری و ئەدەبییە یەکەمین جار لەپاریس لەلایەن [بریتون - Breton ]ی شاعیرەوە بانگەوازی بۆکرا - ڕەسەنی ووشەکە لەدووبەش پێک هاتووە [Su - واتە لەسەروو]، [ realism ] واتە - واقیعی] - لەسەرو واقیعییەوە - وەئەم زاراوەیە بە [سوریالیزم] دەخوێندرێتەوە

بەك [سریالیزم].
٨ - [ئــافــرەتی كولاویی ـDona Rosita ـ بەواتـــای ئافـــرەتی پاكیزەش دیت ـ امرءه عرراء ـ
٩ ـ فەلانجیــزم ـFalangism ـ بزوتنــەوەیــەكی سیــاسی یــە دەكـریتـەوە بو «Falange»ه كانی ئیسپـانیـا، رەسەنی ووشەكە یونــانی یـە، لەسـالی بیستـەكـانـدا ریكخـراویكی سیـاسی بەم ناووەوە لەئیسپـانیـا دامـەزرا، ئەم ریكخـراوە توانی رژیمـە دیكتـاتـوریـە ـ فرانكیست ـ ەكـەی خوی بەسـەر ئیسپـانیـادا بسپینی ـ لە سالی ١٩٣٩ دا هاتنــە سەرحـــوكم هەتـــا سالی ١٩٧٦، بە مردنی سەروكـــەكـــەیـــان [فـرانچیسكـو فرانكـو ـFrancesco Franco ] حوكمداریان كوتایی پی هات.
١٠ ـ «Ode a Walt Whitrman» ـ كورانی یەك بو والت ویتمان ـ ئەم بەرهــەمەی لوركا كە تەرخان و تایبەتە بە [والت ویتمان] كرنكی یــەكی زوری هەیە، چونكە ویتمان ـ یەكیكە لەشاعیرە ئەمــەریكی یـــە بەنــاوبـانكـەكـانی جیهـان، سالی ١٨١٩ لەدایـك بووە، لە [١٨٩٢]دا مردووە. بەوە دەنـاسـریتـەوە كە شاعیری كومەل و شاعیری خودی خوی بووە، شاعیری ئیستاو شاعیـری دیمـوكراسیەت بووە، شاعیری سروشت و شاعیری هەستەكان بووە.

* * *

## چەند نمونەیەكی شیعرەكانی:

### كوا دەستەكانم دەتوانن..؟

لەتاریكی شەوەكانا
لەنیوان دل و زمانا، ناوت دینم
ئەوكاتانە ناوت دینم
كە ئەستیرەكان دەم دینن،
لەئاوی مانگ بخونەوە
كە نهینی یەكان دەنوون و
لەچاوم خودەشانەوە..
كە كاتژمیرە شیتەكەم
كاتە كونە مردووەكان
وەك «ئیستا» دەخاتە سەرریم

* * *

ئالەم شەوە تاریكەدا
لەدوورەوە، ناوت دینم
ناوكەت دەنگ دەداتەوە
لەئەستیرەكانیش دوورتر
لەبارانە شیرینەكانیش
خەمبارتر، لەكیانما دەنگ دەداتەوە..

* * *

بلی ی بتوانم جاریكی دیكە
هەروەك جاران خوشم بوی ی؟
كوا دەستەكانم
دەتوانن كولی «مانگ» هەلوەرینن؟
كەروابی دلم تاوانی چی یە؟
كەرتەم برەوی،
چ حەزیكی نوی،
پاكتر.. بی دەنگ تر، ئەكا چاوەری؟
بەلام دەستەكان
هەرگیز ناتوانن...
بگەنە «مانك»ت و
گول هەلوەرینن..!

* * *

ـ كرانادا ١٠/١١/١٩١٩ ـ

### دلیكی نوی...

دلم وەك ماریك
كاژیكی لەبەرخوی دامالیوە
لەدرزی پەنجەی دەستەكانمەوە
من سەیری ئەكەم
ئەبینم دلم پرە لەبرین
پرە لەهەنگوین

* * *

ئەوبیر و هەستەی
لەدەم و چاوتا حەشارت دابوو
كوا چی یان
لی هات؟
كوان ئەو گولانەی لەگیانی عیسا
وەیان لەگیانی دژ بەعیساكان،
بون و بەرامەی خوشیان... وەرئەگرت؟

* * *

ئەی ئەو ڕوخسارە هەژارەی
ئەستیرەی خەیالی منت،
چەوساندەوە
گیانی شەکەت و سستم نەخوشە
بوگشت ئەوانەی خوشم ئەویستن
ئیستا هیچیانم،
بی‌تو خوش ناوی
※ ※ ※
لەتودا بەرهەمی زانست،
مومیای چەندین دیرە شیعری
خوم ئەبینم . . .
لەتودا هەیکەلی ئیسکی
«بی‌تاوانی» یە کونەکان و
«نهینی»یە ڕومانسی‌یەکانی
خوم ئەبینم . . .
※ ※ ※
بەدیواری موزەخانەی عەشقمەوە
ئەوینەکەت،
لە گوشەیەکا دائەنیم
نزیك کولی ساردەوەبوو
لەنزیك کولی خەولیکەوتووی.
خراپەمەوە. دات ئەنیم.
※ ※ ※
نامیلکەی خەمی خوشەویستی من
درەختیکە بەرز
لەسەر چلیکی هیلانە بکە . .
هەتا بزانی. هەموو بالداران
کام چریکەیە ئەکەنە دیاری
بو هەلاتنی خوری هیواکان؟
※ ※ ※
- کرانادا حوزیرانی ١٩١٨ -

## کورانی پایز

ئەمرو ئەستیرە درەشاوەکان
وان لە دلمدا
کەچی لەتەما
تولەڕی‌گەکەی خوشم وون ئەکەم.
ڕووناکی کەهات،
بالەکانی من لەبیخ دەردینی
خەمیش بەئاوی جوگەلەی خەیال
لەڕووی «یادەکان» ئاو ئەپرژینی . .
※ ※ ※
هەموو گولەکان، ئەمرو کە سپین
سپین وەك خەم و وەك ئازادەکان
گولی سپی نین،
سەرپوشی بەفریان داوە بەسەردا
پیشتر قردیلەی پەلکەزیرینە
بەسەریانەوە، بریسکەی‌ئەهات . .
کەچی ئیستاکە
لەسەر ڕوحیشم بەفر ئەباری
بەفری ڕوح کلوی ماچ ئەبارینی.
دیمەنەکانیش شوڕئەکاتەوە
بو بەر ڕووناکی، یا بو سیبەری،
ئەو کەسەی بیری لی‌ئەکاتەوە.
※ ※ ※
بەفری گولەکان ئەتاویتەوە
بەلام ئەوەی ڕوح، ئەمینیتەوە
تەنیا [زەمەن]ە بە نینوکەکان
ئەتوانی فری بتوینیتەوە.
※ ※ ※
کی ئەزانی
کەمردن هات، بەفریش ئەمری؟
یان بەفری نوی‌و،
کولی جوانتر ئەکەنە جی؟
کی ئەزانی
هەروەك عیسا فیری‌کردین
«ئاشتی»، لەدلمانا ئەبی؟
یان «ئاژاوە» کەورەئەبی‌و
«چارەسەر» یش هەروون ئەبی؟
کی ئەزانی

ئەگەر «خوشەویستی» فیر بین،
چیمان لی دی؟
گەر بەرەبەیان لەگەردووی،
زانستی‌یەکاندا بمری
چی ئەبەینە ژیر خاکەوە؟
ئەوسا [باشە]،
کی ئەزانی ئەگەر هەبی؟
یان [خراپە]،
بەشانمانەوە سوار ئەبی؟
***
گەر هیوا بمریت
[بابل] سەرلەنوی بیتەوە ژیان،
بەرووناکی کام مەشخەلە
رووناك ئەبن شەقامەکان؟
* * *
گەر [شینی‌ئاسمان] خەوی‌بی
[بی‌تاوانی]ی
بو کوی سەری خوی هەلئەگری؟
ئەی دل چی‌یە،
ئەگەر تیری‌عەشقی نەبی؟
ئەگەر «مردن» دوا ویستگەبی
شاعیرەکان،
شتە نووستووە نادیارەکان
ـ کەکەس یادیان ناکاتەوە ـ،
بو کوی ئەچن،
چی‌یان لی‌دی؟
ئەی خوری هیوای شتەکان
ئەی ئاوی روون
ئەی مانگی نوی
ئەی دلی هەموو منالان
ئەی روحی رەقی بەردەکان
ئەمرو ئەستیرە درەوشاوەکان
وان لە دلمدا
هەموو گولەکان ئەمروکە سپین
سپین وەك خەم و
وەك ئازارەکان . . .

* * *

ـ کراناداتشرینی دووەمی ۱۹۱۸ ـ

ئیوارە
جیهان ئیوارەی لیزمەبادانە
لە شەکەت بوونی خولەمیشیا
من وا ئەی‌بینم .
درەختی ووشك .
ژوورە چولەکەم .

وینە کونەکان .
ئەوکتیبانەی،
هیشتا نەمخویندوون . . .
ماتەمینی‌یەکان،
لەنیوان گیانم و دیوارەکانا
هات وچو ئەکەن . . .
ـ کی ئەزانی
ئەگەر سروشت پیم ببەخشی،
روحی وەکو کریستال بی‌و
هەرگیز نەشکی . . . ـ
دل و روح هەردوو
لەخەما تاسان .
لەبەرخومەوە ورینەنەکەم :
کەس نی‌یە ووشەی دلم ببیستی
ووشەم وەك کەلای دەم شەپولی ئاو
لەژوورەکەمدا لەنجەولار نەکەن .
ئەی خوشەویستم تەنیا بو چاوت
لە دەریای خەما خوم شەکەت ئەکەم
خەمی رابووردوو،
خەمی روژانی عەشقی داهاتوو .
جیهان ئیوارەی لیزمەبارانە
لەشەکەت بوونی خولەمیشیا
من وا ئەی‌بینم .
* * *

ـ تشرینی دووەمی ١٩١٩ ـ

**سەمای ناوەوە**

بۆ گابریێك - Gabrel -

ئەودلەی لە قوتابخانە
لەگەل «ئەلف وبی»دا هەم بوو
ڕەنگاوڕەنگ وینەم کردبوو
لەلای تۆیە
ئەی شەوی ڕەش؟
[سارد . . سارد
وەك ئاوی چەمەکان] .
بەلام دلم
بەچناری زانستی‌یەوە
هەلواسرابوو
کەچی «کرم»
لەسەرتاپای گیانی‌دابوو
لەلای تۆیە
ئەی شەوی ڕەش؟
[گەرم . . گەرم
وەك ئاوی بیر] .

خۆشەویستی دودلی من
قەلایەکی بێ‌شوودابوو
لە سێبەری بێ‌هێزیا
بەبێ‌چارە ڕاکشابوو
لەلای تۆیە
ئەی شەوی ڕەش؟
[گەرم . . گەرم
وەك ئاوی‌بیر] .

ئەی‌خەمە بالا بەرزەکە
ئەی ئازارە بەنێشەکە
لە لانەتا
سێبەر [ڕیتر . ئەچێتەوە

ئەمە ڕاستە
شەوە ڕەشە تاریکەکە؟
[گەرم . . گەرم
وەك ئاوی‌بیر] .

ئەی دلەی ویل
دلەی وون بوو؟
یادت بەخێر
وەکو مردوو .

* * *

ـ ڤاگەدی زویادە ١٦ / تەمموزی / ١٩٢٠ ـ

## پەراویزی شیعرەکان : ـ

ئەم شیعرانە لەسەرچاوەی ناوبراو [کتێبی شیعر ـ Libro de Poemas ] ـ چاپی [١٩٧٥]ەوە وەرگێراون ـ ئەمەش ناونیشان و ژمارەی لاپەڕەکانیان :

١ ـ کوادە ستەکانم دەتوانن ـ لاپەڕە ـ ٥٥ ـ
«ئەم شیعرە ناونیشانەکەی دەستکاری‌کراوە، ئەپێتوی ئەوەدا کەمانایەکی مەعقوول بکەیەنی لە کوردی‌دا، ناونیشانەکەی بەئیتالی ئەمەیە ـ

- Potssero lemie mani Sfoliare...

٢ ـ دلیکی نوی ـCuore Nuovo ـ لاپەڕە91 ـ

٣ ـ خۆزانی پایز ـCanzone dautunno ـ لاپەڕە 35. 36 ـ [« بابی ، مەبەست لە سەرسەختی یەتی بابی یەکەیە ، [خۆزگە] ئەم ناوەی بیرەدا وەك ڕەمزێك ؟ بە کارهێناوە بۆ ئەو کارەسات و بەسەرهاتە بێز وویستەی بەپێوەندییان بە ئیشتەنی هیزوتوانا مرۆڤ و دومەندی مرۆڤایەتی‌یەوە هەیە] .

٤ ـ ئێوارە ـSera لاپەڕە101

٥ ـ سەمای ناوەوە ـBallata interiore ـ لاپەڕە 106 . 107 ـ ئەم شیعرەی بۆ ـ گابریل ـ ناویك ووتووە ـ

* * *

# هۆنراوەی تازەی کوردی و بزووتنەوەی شێوەو ناوەرۆک

● ظاهر حەمە غریب ●

**ئەدەب و فەلسەفەی نوێ:**

سەرهەڵدانی جموجوڵی ئەدەبیٌ لە جیهانی نوێدا زۆر بەرِوونی بەستراوە بە جموجوڵ و گوڕانی پیشەسازیو کۆمەلایەتیو رامیاری، کە هەریەك بۆیەکتری کاریگەریان هەبووە. لەگەڵ ئەوەش دا جیهانی نوێ جیهانێکی کراوەو فراوان و هاوپەیوەندە، بە پێچەوانەی قۆناغەکانی دێرین کە بەهۆی باری دواکەوتنەوە، دابڕان و لێك جیایی بۆچەندان کۆمەڵ و ناوچە ئەدگارێکی روون و لە بەرچاو بوو.

پاش ئەوەی شۆرشی، پیشەسازیو لەگەڵیا شۆرشی رۆشنبیری هەلگیرساو سەرتاسەری ئەورووپای گرتەوە، گەلانی ئەو ناوچەیە گەشیشتنە رادەی ئەوەی ئاستی بیرکردنەوەو تیروانینیان بەرامبەر بە زۆر شت بگۆریو گەشە بسێنی. هەر بەهۆی ئەو شۆرشانەوە بوو کە بۆچوونی، فەلسەفی، ریبازێکی نوێی، گرتە بەر بۆ لێکدانەوەی هەموو ئەو دیاردانەی کە پەیوەندیان بە بوون و زانست و مرۆڤەوە هەبوو. هەر بۆچوونی فەلسەفی تازە بوو کە زانستی ئیستای بژارکردو کۆزەرەی بیرە کۆن و بە سەرچووەکانی لێ گرت...

ئەم بۆچوون و لێکدانەوە فەلسەفی یە تازەیەی، کە لە ئەورووپاوە لێشاوی بەرەو جیهانی تازە برد، هەموو بوارێکی بەپێوانە زانستی، یەکەی پیوانە کردو بە چاوی وردبینیو رەخنەی شیکارانەوە هەڵی سەنگاند. سەرەرای ئابووریو ئایین و رامیاریو کۆمەلایەتی، ئەدەبیشی خستە بەر تیشکی لێکدانەوەو بەرەو گۆرانکاری پالی پێوەناو چەندان کە لە نووسەرو ئەدیب بوون بە بزوێنەری ئەو کاروان ئەدەبی یە تازەیە... شۆرشی، رۆمانسی لە ئەدەب دا، پشتی، کلاسیکی دا بەزەویداو هەر بەپێی یاسای دژایەتیو ململانێی نێوان کۆن و نوێ لە فەلسەفەی سەردەم دا، بۆ بەربەرەکانی رۆمانسی، ریالیزم بە هەموو لقەکانیەوە هاتە کایەوەو رۆمانسی پەك خست و هەنگاوی، بەردەوام بوونی لێ سەندو خۆی، کەوتە رێ...

**ئامانجی سەرەکی ریالیزم**

ریالیزم لە ئەدەب دا هاوارێکی، تازەی مرۆڤایەتی یە بۆ وورە وەبەرخستنەوەی مرۆڤ. ئەو مرۆڤەی لە ململانێیەکی سەرسەخت دا نرخی رەوای لێ دەسەندریو بەچاوی کالاو

وزەی، کاری پشت گوێ خراو سەیردەکری و زۆر بەئاسانی ناچاردەکرێ ببێتە سووتەمەنی، ئەو دژایەتی یە سەختانەی کە رژیمە تازەکانی رامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی دەیهێننە کایەوە بۆ خۆگرتن و دەست بەسەرگرتنی پلەی بەرزی دەسەلاتی ئابووری و رامیاری. ئالێرەدا ریالیزم هاتە کایەوە بۆ رەخنەگرتن لەو بارە دژوارانەو پاشان دژوەستانی و لە ئەنجام دا چارەسەرکردنی ئەو کێشانە. . .

هەروەها لە رێگای ئەم ئەدەبەوە بە شێوەو ناوەرۆکێکی تازەوە، ناوەرۆك و شێوەی ئەو ژیانە شیتەل دەکرێتەوە کە کۆمەل بە پەرۆشەوە هەولی لێ تێگەیشتنی دەدات.

ئەدەبی، ریالیزم لە پال زانستەکانی تردا ئەو رێگایەی گرتوتە بەرو بەهۆی باری یاسایی و زانستیانەیەوە توانی لە سنووری گەلانی ئەوروپا بپەرێتەوەو چیا سەختەکان و ئۆقیانووسە بەرینەکان ببرێ و هەموو گۆشەیەکی زەوی بتەنێتەوە. . .

## گۆرانی شیعر لە قوناغی، ریالیزم دا

شیعر وەك بەشێك لە ئەدەبی ریالیزم گۆرانیکی زۆر ئاشکراو لەبەر چاوی بەسەردا هات و توانی کۆت و پێوەندی کلاسیکی فرێبدات و فرمێسکی رۆمانسیش وشك بکات ئەو گۆرانانەی کە بەسەر شێوەو ناوەرۆکی شیعری ریالیزم دا هات، بە رێگای پەیوەندی و شەرە جیهانیەکانەوە خۆی کشان بەرەو ولات و ناوچەکانی رۆژهەلات و جیهانی سێهەم. زمان بۆ زمان وەرگێردراو وەرگیراو بەپێی بۆچوونی فەلسەفی نوێش لێکدرایەوە. . .

لە پێش هەموو دەستەکەوە رۆشنبیران بە پەسەندیان زانی و بۆ سەقامگیرکردنی بوون بە شورەسواری ئەو شورشە تازەیە.

کاتێك شەری جیهانی یەکەم هەلگیرسا سەرەتای دەستپێکردن بوو، بەلام کاتی شەری جیهانی دووەم هەلگیرسا سەرەتای سەقامگیربوونی ئەوگۆرانکاریانە بوو. هەر لەپاش کزبوون و کوژانەوەی شەری جیهانی دووەم بوو کە ئەو گورانکاریانە لە ئەدەبی رۆژهەلات و بەتایبەتی ئەدەبی کوردی دا وردەوردە سەری هەلداو بوو بەهۆی لەبەر یەك هەلوەشاندنی، نەریت و خوی، کلاسیکی لە ئەدەب دا ئەو نەریت و خووە کلاسیکی یەی کە لە ئەدەبی فارسی و عەرەبی و تورکی یەوە خوی خزاندبووە ناو ئەدەبی کوردی یەوە. جا لەبەر ئەوەی شورشەکە سەرتاسەری و جیهانی بوو، چەکی راپەرین و تازەبوونەوەش بە سەرشانی ئەدەبی کوردی یەوە بلندکرایەوەو هەموو کێشانەو پێوانەو بۆچوونی کلاسیکی گوری و خستیە حالەتی گیانەلاو سەرەمەرگی ئەمرۆکەی.

## ئەنجامی، شەرە جیهانی یەکان و ناوەرۆك و شیوەی شیعری نوێی کوردی. . .

سەرەتای سەرهەلدانی شیعری نوێی کوردی هەر لەو سالانەوە دەستی پێکرد کە ئەنجامی شەرە جیهانیەکان بەرەو سەقامگیربوون رۆشت و دەولەت و رژێمی نوێ لە رۆژهەلات و رۆژئاوادا دامەزرێنراو پەیوەندی کۆمەلایەتی و ئابووری گۆرانی تێکەوت و ئاستی ئابووری گەشەی سەندو مافی مرۆڤ خرایە روو بۆ ئەوەی پارێزگاری پێوە بکرێ! زۆر بارو بۆچوونی نوێ کاری لە کۆمەلی کوردەواری کرد کە بەخۆیدا بچێتەوەو ریزی کاروانی مرۆڤایەتی، بەجێ نەهێلێ و لە بیری تەسکی تیرەگەری و دەرەبەگایەتی خۆی رزگاربکات و

بیر لە بەیوەندیەکی بە هێزو بە هێزتر بکتەوە.

هەر ئەو بۆچوونە تازانەی کە بەرامبەر بە زۆر شت خراتە روو وەك: بوون و ئایین و هەژاریو خێزان و دەولەت و رەوشت و ئافرەت و سرووشت و زانست و هتد

شۆرشەکەی تەقاندەوەو ئەمانەو کاتێك بەپێی فەلسەفەی نوێ لیکدرانەوەو ئەنجامەکانی بۆ کۆمەلگای تازە خرایە روو، ئیتر بواری ئەوە نەما گەلان بەسستیو لەژێر سێبەری نەزانیدا پالی لێ بدەنەوە...

گەلی کوردیش ئەم تازانە رای پەراندو فێری ئەوەی کرد هەول بدات بوون و شارستانیەتی خوی بسەلمێنی... هەر ئەو بوچوونە تازانە بوون بە ناوەرۆکی ئەو بیرە سەرەکیانەی کە لە شیعری ئازادی کوردیدادە ردەبران و هەر ئەوەش بوو کە هاواری کپ ولاوازی کلاسیکیو رۆمانسی، لیرەو لەوی خوی تێکەل کردو وای لی کرد لە سەرەتاوە بە بیگەردیەکەی خوی نەکەویتە ریو ئەم بیگەردبوونەوەیەی هەنگاو بەهەنگاو بیت و وردەوردە بە دەوام بیت تا ئەمرو. شیوەی ئەو شیعرە ئازادانەش شیوەیەکی لە بارو گونجاو بوو بو هەستی، موسیقی ئەو خوینەرانەی کە پەروشی تازەگەری بوون لە هەموو روویەکەوە...

هەناسەی دریژی موسیقای «بحر»ەکانی شیعری عەرەبی کوران بو هەناسەی کورت و موسیقای ئەندازەیی کەلەکیشی پەنجەیی و کیشی ئی هەلکیشی ریژەیی و هارمونیدا بەدی دەکرا. ئەو شیوە شیعریانە بەپیی چیژ وو ئارەزوو بو موسیقا بەکار دەهینرین و شاعیرەکان سەربەستن لە بەکار هینان دا. جا ئەگەر توانیان ئەو سەلیقە موسیقییەی کە لە شیعردا هەیە بی پاریزن، سەرکەوتوو دەبن. شیوەی شیعری ئازاد لە وینەی شیعری تازەو نمونە رەوانبیژییەکان و کیش و موسیقا بە دوورنی یەو ئەو شیعرەش کە ئەو رەوشتە ئەدەبیانە بیانووی وشەی ئازادی‌یەوە ون دەکات، نیشانەی پلەی نزمە روشنبیری ئەو شاعیرە دەگەیەنی، چونکە وشەی ئازادی بو شیعر زیاتر تەرخانە بو ئازادبوون لە دەربرینی بیرو بوچوونی ناوەروك.. هەر ئازادی ناوەروکە وا شاعیر دەکات شیەیەکی موسیقی جیا هەلبژیری بو دەربرینی ناوەروکە تازەکە... کەواتە ئەگەر چەند وشەیەکی گیروگەوار وبی ماناو ناوەروك بەکیشی پەنجە یا هەر جوریکی تر ریك خران، نابن بە شیعریك لەناو فەرهەنگی شیعری ئازاددا، بەلکو دەبن بەورینەیەك کە لەسەرە هەرگی ئەدەبی داتە پیووی، مروڤە تورەهاتەکاندا درووست دەبن... ئەمە کوتە لیدوانیك بوو لەو بزووتنەوە فراوان و قوولەی لە ناوەروك و شیوەی شیعری ئازادی کوردیداهەیە. بیگومان ختنە رووی نمونەو سەرچاوە پیویستی بە دریژە پیدان و بواری تر هەیە.

لە کوتاییدا ئەم بوچوونەی «بدر شاکر سیاب» وەردەگرین بو شیعری ئازاد کە توانیویەتی یاسایانە ئەووایە بپیکی. کە ئیمە ویستومانە بو شیعری کوردی دەری، ببرین، کە ئەوەش ئەمەیەو دەلی:

**«شیعری ئازاد لە ژمارەو جیاوازی تەفحیلە لیکچووەکانی نیوان دیریك و دیریکی تردا، زیاترەو بریتی، یە لە بنچینەیەکی** هونەری تازەو ریرەویکی ریالیزمی تازە، بو ئەوە هاتوتەکایەوە کە ئارەزووی رومەنتیکی و ئەدەبی، بورجە عاجیەکان و راصنی، کلاسیکی بی، شیل بکات. هەروەها بو ئەوە هاتوە. کە ئەووتارە شیعریانە بی شیل بکات کە پیوە سیاسي، و کومەل زان کان خوویان بە نووسینی یەوە گرتبوو.»

١٩٨٦ - هەولیر

## سەرچاوەکان:-


١ - بدر شاکر سیاب - ریتا عوص - بغداد - ١٩٨٤، طبعة الثانية
٢ - کوردستان لە سالەکانی شەری جیهانی یەکەم دا
د. کمال مظهر حمد
٣ - وانەکانی «رەخنە» بویری، چوارەمی، بەشی، کوردی کولیژی ئەدەبیات
نووسین و ئامادەکردنی. د. عمد سه دبع.

# شانۆيى

# گه‌له‌گورگ

چيرۆكى
حسين عارف

ئاماده‌كردنى بۆ شانۆ
شه‌فيق محه‌مه‌د

[illegible]ـرى شانۆيى يه‌كه: ژووريكه. ده‌رگاى ژووره‌كه [illegible] لاى ڕاستى ديوارى به‌رانبه‌ر جه‌ماوه‌ر. لاى خوارووى [illegible] شانۆش په‌نجه‌ره‌يه‌كى [١م × ٥,١م] هه‌يه. [illegible]ـه‌كانى ناوژووره‌كه ساده‌و ساكارن؛ سندوقيكى [illegible]: نوينى له‌سه‌ر هه‌لچنراوه. دولابيكى ته‌ل: حاجه‌ت و [illegible] تروتفاقى ناومالّيان تى ئاخنيوه. يه‌ك دوو ته‌نه‌كه‌و سه‌تل: [illegible] تيدايه‌و له‌نزيك ده‌رگاكه‌وه دانراون. قولينه‌يه‌ك نان [illegible] به‌رميليكى بچووك دانراوه. پشته‌وه‌ى ده‌رگاكه‌ش [illegible] قه‌لاپه‌چن كراوه. زۆبايه‌ك به‌به‌رده‌وامى [illegible] نيله‌نيلى ديت. ته‌نافيك. پيويستى ترى [illegible] . . . ]

## به‌شى يه‌كه‌م

[illegible]ـه‌وه. چراكه به‌كزى ده‌سووتى. ده‌نگى گه‌رده‌لوول ديت، [illegible] و بارام نووستوون. . ئايش به‌ده‌م خه‌وه‌وه هاوارى «بارام» ده‌كات و سه‌رى له‌سه‌ر پشتيه‌كه ژير سه‌رى به‌م لاو به‌ولادا ديني و ده‌بات هه‌روه‌كو ئه‌وه‌ى خه‌ويكى سامناك ببيني. . له‌پر ده‌نگى زرمه‌ى كردنه‌وه‌ى ده‌رگاكه ديت، ده‌نگى گه‌رده‌لووله‌كه به‌رزتر ده‌بيته‌وه، ئايش له‌گه‌ل زريكه‌يه‌كدا راده‌په‌ريته سه‌رپى و به‌ره‌و ده‌رگاكه راده‌كات تا دايخات، به‌لام گه‌رده‌لووله‌كه ده‌يگه‌رينيته‌وه دواوه، خوى گورج ده‌كاته‌وه به‌ره‌و ده‌رگاكه هه‌نگاو ده‌نى، به‌گران هه‌نگاوى بو ده‌نرى، له‌گه‌ل زريان و گه‌رده‌لووله‌كه‌دا ده‌كه‌ويته ململانى. . له‌پيشه‌وه‌ى شانو به‌دريژايى ژووره‌كه پارچه قوماشيكى سپى هه‌يه، له‌گه‌ل به‌رزبوونه‌وه‌ى ململانيى نيوان ئايش و گه‌رده‌لووله‌كه پارچه قوماشه‌كه ورده ورده به‌رزده‌بيته‌وه؛ وه‌كو ئه‌وه‌ى به‌فربيت و له‌ده‌رگاكه‌وه هاتبيته ژووره‌وه‌و له‌پال ئه‌م ديواره‌دا كوبووبيته‌وه. به‌هه‌رحالى ده‌بى ئايش ده‌ستى له‌ده‌رگاكه گير ده‌بى، ده‌يه‌وى دايبخات به‌لام گه‌رده‌لووله‌كه ريى نادات و فريى ده‌داته سه‌ر جيگاكه‌ى بارام، ئايش هاوارى بارام ده‌كات و به‌ئاگاى دينيته‌وه، بارام له‌جيگه‌كه‌ى ڕاست ده‌بيته‌وه‌و

هەر بەدانیشتنــەوە سەیــری ئایش دەکــات. ئایش دەیـەوێ جارێکی تـر هەوڵ بداتـەوە بۆ داخستنی دەرگاکە، لەپڕ دەنگی زرمـەی کردنـەوەی پەنجـەرەکـەو شەقـەی بەیـەکدانی دێت. دەنگی گەردەلـوول و زریـانـەکـە بەرزتر دەبێتەوە، ئایش تەواو شپــرزە دەبــێ و ترس و سام بەرۆکــی دەگــرن. رادەکــات پەنجــەرەکــە دابخــات بەڵام گەردەلــوولــەکــە بۆ دواوەی دەگــەڕێنێتــەوە، جارێکی تـر هەوڵ دەدات بێ سـوود دەبێ. پارچـە قوماشــە سپی یـەکـەی پێشـەوەی شانـۆ بەرزتر دەبێتەوە بەجۆرێکی وا خەریکە ئایش لەچاووون دەبێ. گەردەلوولەکە ئایش دێنێ و دەبـات، ئەو گەردەلـوولـەی لە پەنجەرەکەوە دێتە ژوورەوە فڕێی دەدات بۆ لای دەرگـاکـەو، ئەو گەردەلوولەش لەدەرگاکەوە دێتە ژوورەوە فڕێی دەداتەوە بۆ لای پەنجەرەکە. ئایش تەواو شەکــەت و مانــدوو دەبێ. گەردەلــووکـە لوولی دەدات، لەروخســارو جوڵەیدا وا دەردەکەوێ کە بەفر خەریکە تەواو داپـۆشێ، هەردوو دەستی بۆ قوڕگی دەبـات وەکو ئەوەی بەفــر خەریـکــە دەیخنکێنێ. پارچــە قومــاشــەکــە تەواو بەرزبـووەتـەوەو ئایشیش وردە وردە لەچاووون دەبێ، ئێستا بە تەنهــا هەردوو دەستی دیـارە کە بەرزی کردوونـەتـەوەو داوای فریـاکـەوتنی پێ دەکات. ئەوانیش دیار نامێنن. لەپڕ دەنگی زریکـەی ئایش [پارچە قوماشە سپی یەکە دادەگیرێ] ئایش لە جێگــەکــەی دەردەپــەڕێ پەلامــاری پەنجــەرەکـە دەدات دایبخـات. [بـەڵام پەنجەرەو دەرگاکە داخراوان] بارام لەخەو رادەپەڕێ و بەرەو لای ئایش رادەکات]

**بارام**: ئـایش.. چی بووە؟ [کــە دڵنیــا دەبێ هیـچ رووی نەداوە] دیــســانــەوە خەوْنێ بیــنــی. هەستــە وەرەوە سەر جێگاکەت. بنوو هیچ نی یە.

**ئایش**: ـ بارام تکات لێدەکەم با بەس بێ، ئەمە چۆن ژیانێکە ئێمـە هەمـانە. با ئیتر بەس بێ. لەو رۆژەوەی ئەم زریانە پیسە هەڵی کـردووە شەوی هەزار خەوی ناخـۆش و ترسناك دەبینم، کار وا بڕوا شێـت دەبـم. ئەوەتــەی هەم زستــانی وا سەختم نەدیـوە، بە عومـرم نەمـدیـوە ئەوەنـدە بەفر لە ئەرز بکەوێ. وا حەفتەیەك زیاترە چاوی وشك نەکردووەتەوە، باڵا پیاوێك بەفر باریــوەو لەوەش ناچــێ بەم زووانــە خۆش کا. ئەمــە چۆن زریانێکە؟! گوێبگرە دەڵێی گورگە دەلوورێنێ.

**بارام**: ـ بنوو ئایش گیان یەك دوو سەعاتی تر شەبەق ئەدا، بنوو.

**ئایش**: ـ زریـان نی یـە بەڵای خوایە؛ مەگەر هەر ئەو زریانە وا بووبێ کە سی و پێنج سال لەمـەوبـەر روویـداوە، وەکو باوکم دەیگێـرایـەوە پانزە رۆژی رەبەق نەیهێشتووە کەس سەر لەکوێ دەربێنێ، باوکم دەیووت ئەو سال سەرما زۆری کەسیرە کرد، زۆر کەس بوون بەژێر بەفرەوە بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێ.

**بارام**: ـ دەستت پێ کردەوە.

**ئایش**: ـ بارام تکـات لێـدەکـەم تا ئەم بەفـرو باوبۆرانـە بەڵاو کارەسـاتێکی بەسـەر نەهێنـاوین، سبـەینێ هەر کە رۆژ بووەوە ئێرە بەجێ بێڵین و بگەڕێینەوە ناو ئاوایی.

**بارام**: ـ دەتەوێ تێ هەڵچینەوە. بەسە بنوو.

**ئایش**: ـ پاشــان پیـاو ئەگــەر لێشی قەومـا با لەئاوەدانیدا لێی بقەومێ، چونکە خێرۆمەندێك دەبێ بەفریای بکەوێ و دەستی یارمـەتی بۆ درێـژ بکـات. بەڵام لەم چۆڵـەوانیـا ئەگـەر لێمان بقەومێ پێم نالێ کێ فریامان دەکەوێ؟

**بارام**: ـ ئایش گیـان خێـرۆمـەنـدی چی و فریـاکـەوتنی چی؟ ئەوانــە گورگن، گورگی دووپێ. هەر کامێکیــان دەگــرێت میکرۆبی کوشت و بڕو دزی و درۆزنی و فرت و فێڵن. من لەناو ئەم کارو کردارانـەیـان هەڵهـاتـووم و گۆشـەگیربووم ئیتر چۆن دەگەڕێمەوە ناویان و دەهێڵم گەرا لەمێشکی منیشا دانێن.

**ئایش**: ـ ئەرێ پێم نالێی ئەو خەڵکە چ خراپەیەکیان بووە یان چ خراپەیەکت لێ بینیوون وا تف و لەعنەتیان دەکەیت؟

**بارام**: ـ تۆوا مەڵــێ، بڵێ لەوەتــەی فامــت کردووەتــەوە چ چاکـەیـەکت لێ بینیوون. ئایش ئەوەی پێی بووترێت پاکی و جوانی، راستگـۆیی لەنـاو ئەو خەڵکـەدا نی یـە. یەك پاشقوڵ لەوی تـر دەدات، ئەو چاڵ بۆ ئەوی تر هەڵدەکەنێ، بەدرێژایی رۆژ خەریکی درۆزنی و فرت و فێـڵ و کوشت وبـڕن. ئەوانـە گەلـە گورگێکن و بەردەوام کەڵبـە لەیـەکتـر تیـژ دەکـەنەوە، تا لەروویت رێزت دەگرن و وا خۆیانت پیشان دەدەن برای گیانی بەگیانین لەپاش ملەش هەزار تانەو تەشەرت لێ دەدەن.

**ئایش**: ـ ئەرێ کابرا تۆ پێم نالێی چیت لەو خەلکە دەوێ؟

**بارام**: ـ پاکی و جوانی. پاکی و جوانیم لەو خەلکە دەوێ. ئەو پاکی و جوانیــەی لەسێی ناوەنــدیـەوە، لەو وەختــەوەی فامم کردەوە خەونم پێـوە دەبینی. کاتێکیش ئامـادەیی کشتـوکـاڵیم تەواو کردو هاتمـە سەرئـەوەی بەکـردار ئەو خەونـەم بێنمە دی، هەر چەنـدم کردو کۆشـام لەنـاو ئەو خەڵکـەدا نەمبینیـەوە بۆیە

هەنێستا ئەو جیهانە پیسەیان، ئەوەتا هەشت مانگی رەبەقە جیهانێکی پاك و جوانم بۆ خۆم و تۆش بنیات ناوە. نە هەقمان بەسەر کەسەوەیە و نەدەشهێڵم کەس ئەو جیهانە پاك و جوانەم لێ پیس بکات. سەد جارم پێ وتی باسی گەڕانەوەم مەکە. زریانە زریان نی یە چش، سەختە سەخت نی یە چش. بۆ من نەزریانە و نەسەخت، گوایە لەزریانی ئەو خەڵکەی تۆ حەز دەکەی بچینەوە ناویان سەخت ترە، نەء، سەخت نەء. ئەمیان ئەوپەڕەکەی ئەگەر هەر بەگیری هێنایت و کەنەفتی کردیت، بەبێ منەت دەتکوژێ و کۆتایت پێ دێنێ بەڵام ئەویان، زریانی ئەو خەڵکە دەتداتە دەم گەردەلوولێکی تاز رۆ هەر دەتبات و دەتبات هەتا پڕ بەدەریایەك ئازارت پێ دەنۆشی و نەشتکوژێ. گرنگ ئەوەیە هەشت مانگی رەبەقی پڕ و پڕ نەتسووەدەیم بردووەتە سەر، هەشت مانگی دوور لەگورگ و گورگایەتی.

[دەنگی وەڕینی «بازە» دێت]

ئایش: ـ بەرام. . گوێت لێ یە؟

بارام: ـ لە چی؟

ئایش: ـ بازە. گوێت لێ نی یە چۆن بەجیرس و تووڕەیی یەوە دەوەڕێ؟

بارام: ـ لە خۆڕایی نی یە شتێکی بەدی کردووە. [دەست دەبات لە ژێر سەرەکەی دەمانچەکەی دەردێنێ، لایتەکەی دەکوژێت بەدەستیەوە]

ئایش: ـ سەعات چەندە؟

بارام: ـ سێ و نیوە. [دەچێتە دەرەوەو دەرگاکە لەدوای خۆیەوە دادەخات. دەنگی وەڕینی بازە توندتر دێت. ئایش لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات. پاش ماوەیەك بارام خۆی دەکاتەوە بەژووردا.]

ئایش: ـ مەسەلە چی یە؟

بارام: ـ [پەتۆکەی لەبەردەکات] چەند تارماییەك لەدوور بەدی دەکەم. لەوە دەچێ گەلە گورگێك بن. [ئایش دڵی دادەخورپێ، بەسنگی خۆیدا دەکێشێ] ترست نەبێ.

ئایش: ـ کەلە گورگ؟! دڵنیایت؟!

بارام: ـ نە. [جامانەکەی لەملیەوە دەپێچێ]

ئایش: ـ چەند دەبن؟

بارام: ـ حەوت هەشتێك [دەچێتە لای زۆپاکە تا خۆی گەرم بکاتەوە] زۆپاکە خەریکە دەکوژێتەوە. دوو سێ بڕداری تێ هاوە. [بەرەو دەرەوە دەڕوات]

ئایش: ـ چی دەکەیت؟ نیازی چیت هەیە؟

بارام: ـ لەخۆتی مەکە بەغایله. تۆلەژوورەوە بەو هەقت نەبێ. من و بازە چاریان دەکەین. [دەچێتە دەرەوە]

[بازە توندتر دەوەڕێ. ئایش شپرزەبەو پەشۆکاوە. رووەو برمدارەکیان دەچێت، چوار پێنج بڕی لێ هەڵدەگرێ و دەگەڕێتەوە لای زۆپاکە. دەرگاکەی دەکاتەوەو دەیانخاتە ناو زۆپاکەوە، ئاگرەکەی خۆش دەکات. . تەقە لەدەمانچەوە هەڵدەستێ، ئایش دڵی دادەخورپێ بەرەو دەرگاکە رادەکات. دەرگاکە دەکاتەوەو بارام خۆی دەکات بەژووردا، دەچێتە لای زۆپاکەوە.]

ئایش: ـ چیت کرد؟

بارم: ـ نەم پێکا

ئایش: ـ ئەوەندە لێتەوە دوور بوو؟

بارام: ـ نەوەڵا. بەڵام دیارە نیشان شکێن نیم.

ئایش: ـ دەترسم نەتویستبێ بیپێکیت دەنا گورگێکی زل و زەبەلاح وەها لەنزیکەوە چۆن لێنادرێ.

بارام: ـ ئێ ئێمە چیمان دەوێ، هەڵهاتنیان و لێمان دووربکەونەوە. هەر ئەوەندە نی یە؟ با. بچنە ناو ئاوایی و لەوێ گورگە دوو پێیەکانی هاوەڵیاندا دەست بلەنە یەخەی یەکتری.

ئایش: ـ [خەیاڵی رۆیشتووە] زۆر حکایەت و سەرگوزشتەم دەربارەی گورگ و گەلە گورگ لەدایکم بیستووە، بەتایبەتی لەساڵانی وەك ئەمساڵی ئێمەدا. تۆبڵێی. . .

بارام: ـ سەیرە! منیش بیرم لەهەمان باس دەکردەوە. بەڕاست تۆبڵێی شەڕیان لێ لادابین و رۆیشتبن بەرێی خۆیانەوە؟

ئایش: ـ تۆدەڵێی بەهەسی حەوت هەشت گورگی دووپێی خاوەن عەقڵ دەکەیت و گوایە لەترسی دەمانچەکەت شەڕت لێ لا دەدەن.

بارام: ـ نەشەدوییلا، بگرە گوایە لەبەر ئەوەی نەم پێکان، بەسوپاس و ستایش کردنەوە شەڕم لێ لا دەدەن.

ئایش: ـ خۆ دەشێ وەها بکەن. بەڵام ئەی ئەگەر وەهایان نەکرد؟

بارام: ـ ئەگەر وەهایان نەکرد دەردەکەوێ کە بێ عەقڵن نەك

خاوەن عەقڵ و ناچار دەیان پێکم ئەوسا ئەوانیش ناچار هەر دەبێ شەڕمان لێ لادەن.

[دەنگی مرەمرو وەڕینی بازە.. ئایش دڵی دادەخورپێ سەیری بارام دەکات، بارام قیت دەبێتەوەو گوێ قولاغ دەبێ.]

بارام: ـ لەوە دەچێ بەڕێــوەبن بێنـەوە، دیـارە شەڕمـان لێ لا نادەن. [پڕ دەکات بەدەمانچەکەیدا هەڵدەسێتە سەرپێ، هەموو بیرو هۆشی چووەتە سەر دەمانچەکە]

ئایش: ـ بارام ئەوە چیتە؟

بارام: ـ دەزانی نیازمە چی بکەم؟

ئایش: ـ چی دەکەیت؟

بارام: ـ پەنا دەبەمە بەر ئەو پەندەی دەربارەی گورگ باوە.

ئایش: ـ کام پەند؟

بارام: ـ بەگۆشتی لاشەی یەکێك لەخۆیان تێریان بکەم وخۆم لەشەڕیـان بپـارێـزم، بۆ ئەمەش دەبێ وازیان لێ بێنم تا تەواو نزیك دەبنەوە.

ئایش: ـ ئەی ئەگـەر وا نەبـوو، ئەوا دەبێ تا بەیـانی خەریکی گورگ کوشتن بی.

بارام: ـ جا بێنەو بەرەی بۆچی یە. ئەوە گەلە گورگ و ئەمەیش گەلە گوللەی مەرگ بە دەستمەوەو درۆو ڕاستی قسەکە ساغ دەکەینەوە.

ئایش: ـ ئاگـات لەخـۆت بێ، گەلە گورگ ئامانیان بۆ نی یە. لەبەر هەیوانەکە دوور نەکەویتەوە.

بارام: ـ ترســت نەبێ. [بـازە دەوەڕێ]ئێ.. ئێ وا هاتم، چەند سەگێکی بەوەفاو دڵسۆزە.

[بـارام دەڕواتــە دەرەوە. بازە تونـدتـر دەوەڕێ. ئایش دێت و دەچێت، لەپــەنجــەرەکــەوە دەڕوانێ.. دەگــەڕێتـەوە لای دەرگاکە..

لەپڕ نەدەنگی بازەو نەهیـچ دەنگێکی تو نابیسترێ، ئایش دڵی دادەخورپێ. دەرگاکە دەکاتەوەو سەردەباتە دەرەوە]

ئایش: ـ بارام.. بارام.

دەنگی بارام کچێ هاتوویتەتە دەرەوە؟ ڕەق دەبیتەوە نەگبەت، برۆ ژوورەوە.

ئایش: ـ بۆ وا بێدەنگ بوون؟

دەنگی بـارام: ـ خۆمـان بۆ ناونـەتـەوە. لێمـانی تێـك مەدە، خەریکن دێنە بەرەوە. بچۆرەوە ژوورەوە.

[ئـایش دێتــەوە ژوورەوە. دەچێت لەپـەنجـەرەکـەوە دەڕوانێتە دەرەوە، پەنجـەرەکـە بەجێ دێڵێ و دەگـەڕێتەوە لای دەرگاکە، گوێ قولاغ دەبێ، لەوێش خۆی بۆ ناگیـرێ و دەچێتــە لای ژوورەکەوە.. تەقە لەدەمانچەوە هەڵدەستێ، دەنگی قروسکەی گورگێـك، بەدوایدا وەڕین و حەپە حەپی بازە. ئایش دەرگاکە دەکاتەوەو دەردەپەڕێتە دەرەوە.]

ئایش: ـ بارام.. بارام..

بارام: ـ [پـاش ماوەیــەك، پەلـی ئایـشی گرتــووەو دێنــەوە ژوورەوە] پێم نەووتیت سەر لەژوور مەهێنەرە دەرەوە؟ تۆ خوا گرتووتی؟

ئایش: ـ بۆ نالێ ئەمجارەش نەم پێکا.

بارام: ـ گەلـە گورگ لەجـاری پێشـووزیاتر بوون. خۆگوێت لەدەنگی بازە بوو چۆن دەوەڕی، جێی بەخــۆی نەدەگـرت، بەهـەر جۆرێ بوو بازەم هێمن کردەوە. گەلە گورگ لەتەیمانی حەوشــەکـە نزیـك بوونـەوە، بەرەورووی من و بازە ڕیـزیـان بەستبـوو، کەگـەیشتنـە ئاستی تەیمـانەکە نیشانم لەیەکێکیان گرتــەوە، پەلــە پیتکـەم هێنـایـەوە یەك وزرمـەم لەدەمـانچـە هەڵســـانــد. گورگــە قروسکــەی کردو ڕەتی برد ئەوانی تــر سڵەمینـەوەو هەریـەکـە بەلایەکدا بەرەو دواوە هەڵاتن. هەر لەو ساتەدا گورگی پێکراو کەوتە درادن بەبەفرەکەو هەڵاتن، پێوەی دیـار بوو پێکـرانێکی کوشنـدە پێکراوە. پاشان گەلە گورگم لە دوور بە قەدپــاڵی گردۆڵکــەکــەی ئەوبـەرەوە بینی، بەیـەکـا دەهـاتن و بەئـاشکـرا دیـار بوو کەنیشتـوونـەتـە گیانی گورگی پێکـراوو ونجـرِ ونجـری دەکـەن. [دەمانچەکە بەرز دەکاتەوە] ئاخری دەمانچە بۆر کاری خۆی کرد.

ئایش: ـ یانی باوڕت هێنا کە شتێکی پێویست بوو، باشە ئەو دەمانچەیە نەبووایە چیت دەکرد؟

بارام: ـ بەتەور.. بەبێڵ.. بەتێلا.

ئایش: ـ ئا بەڵێ ڕۆستــەمی زاڵیت، بگـرە ڕۆستـەمی زاڵیش بوویتـایـە ئەوەت لەگـەڵ یەکێك یان دوواندا پێدەکرا نەك گەلە گورگێك، وا نی یە؟

بارام: ـ ئۆباڵ بەگەردنم وایە.

ئایش: ـ بارام تۆ لەتاو گورگی دووپێ هەڵهاتی، دە ئەوەتا لێرە گورگی چوار پێ یەخەی گرتووین.

بارام: ـ ئایش گیـان ئەم گورگـە چوار پێیانە هەر ئەوەندە دێنە سەرت و کەڵبـەت لێ تیـژ دەکـەنـەوە تا [دەمـانچـەکـەی بەرز

دەکـاتـەوە] ترسیـان دەخەیتە دڵ. بەڵام گورگە دوویی‌یەکانی ئـوایی بیست و چوار سەعــاتــە لەبـەر لووتـدا دێن و دەچن و کەڵبـەت لێ تیـژ دەکـەنـەوەو سڵ لەهیچیش ناکـەنەوە. مادام بازەو دەمـانچـە هەن لە هیچ مەترسە، پێش ئەوەی گەلە گورگ نزیـك بنـەوە بازە ئاگـادارمـان دەکاتەوەو منیش بەمە قڕیان تێ دەخـەم. [دەمانچەکەی لەبەر پشتوێنی دەردێنێ شانەکەی لێ دەردەهێنێ و فیشـەکـەکـانی لێ بەتـاڵ دەکاتەوەو دەیانژمێرێ] پێنج [شانەی یەدەکیش دەردێنێ] ئەمیش حەوت ئەوە دوانزە. وا تیـدەگەم هەشت فیشەکی‌ترم هەیە، ئێ ئەوە بیست بەسە، خۆ شەڕە سەنگەر نی‌یە.

**ئایش** : ـ بارام تۆ بلێی بێنەوە؟

**بارام** : ـ دوور نی‌یە بێنەوە. گەلە گورگەو برسی‌یە بۆنی هەشت نێچیری ناو ئاکە خانوویەکی تەریکی دوور لە ئاوایی‌یان کردووە.

**ئایش** : ـ ئەی چار؟ چار چی‌یە؟

**بارام** : ـ چار؟ چار ئەوە دەمــانچـەو گوللەو من و بازە، ئەوەش ئەوان و هیــرش و پەلامــاردان بەکــەلبــەو نیــنـوك ئێـمــە ئەسـەنگــەرداین و خومـان ئامادەکردووەوە ئەوان هێرش دێنن، خو توپ و نارنجـۆکیـان پێ نی‌یە هەڵمانتەکێنن. ئەوان هەیانە کەڵبـەو من هەمـە گوڵە، پێش ئەوەی ئەوان کەلبـە لە من گیـر بکەن، من گوڵە دەسرەوێنمە ئەوان و برایەوە.

**ئایش** : ـ دەزانـی چەنـد ئیـشـیـکی چاکت کرد کە ئەسپ و بزنەکانت گواستەوە ژ وورەکەی ئەوبەرمان

**بارام** : ـ ئەی چۆن. ئەو تەویلە پەڕپوتەدا بمانایەتەوە ڕەق دەبوونەوە.

**ئایش** : ـ هەر گورگ دەیخواردن.

[لە دوور دەنگی لوورەی گەلە گورگ دێت ئایش و بارام ملیان قوت دەکـەنـەوەو گوی قوڵاغ دەبن.. دەنگی وەڕینی بازە.. لوورەی گەلـە گورگ و وەڕینی بازە تێکەڵ بەیەکتر دەبن. بارام کڕ و خاموشە]

**ئایش** : ـ بارام ئەوە بیر لەچی دەکەیتەوە؟ بۆ وا مات و خاموش بوویت؟ گوێت لە بازە نی‌یە؟

**بارام** : ـ ئەوە دەچی نزیك بوونەوە، چاکتر وایە بچمە دیزەیان.

ئایش : ـ بازە گیان وووریابە، ئاگاداری خوت بە.

بارام : ـ [دەمانچەکەی دەردێنێ] دەیهێنێتە دەرەوە، بە سەرمات نەبێ.

**ئایش** : ـ چی بکەم بەدەست خۆم نی‌یە، خۆم بۆناگیرێت، تۆ لەدەرەوە بیت و گەلە گورگێکی درو برسی کەڵبەت لێ تیژ بکەنەوە.

**بارام** : ـ ترسی منت نەبێ [دەمانچەکەی بەرز دەکاتەوە] نابینی چۆن بۆیان لەسەرپێم.

[بـارام : ـ دەچێتـە دەرەوە. ئایش هەڵـدەستێ و بەژ وورەکـەدا دێت و دەچێ، گوێ دەنێ بەدەرگــاکـەوەو گوێ قوڵاغ دەبێ، واز لەدەرگـاکـە دێنێ، بەژ وورەکـەدا دێت و دەچێ.. دەنگی تەقـەی دەمـانچـەکـە، بەدوایـدا بازە بە حیرس و توورەیی‌یەوە دەوەڕێ.. پاشـان بارام پڕ بەقـورگی هاوار دەکـات «بـازە.. با.. زە..» ئایش دلی دادەخـورپێ و دەکێشێ بەسنگیـدا. دەنگی یەك دوو تەقـەی‌تـری دەمـانچـەکـە. ئایش رادەکـاتـە دەرەوە... پاش ماوەیـەك ئایش قوڵی بارامی گرتـووەو دێنـەوە ژ وورەوە. بارام ڕەنگی بووە بەلیمـوی زەرد، لێـوی دەلەرزێ‌و بەربینی قوڵپ دەدات، ترس و سامێکی تێکـەل لەحەپەسان و رامان لەچاوانیدا قەتیس بوون شێتانە بەدەوری خۆیدا هەڵدەروانێ.

**بارام** : ـ زۆری پێ نەچێ دێنــەوە، کە هاتنــەوە ئەمجـارە من لوول دەدەن و وەك بازەم لێدەکەن، ئینجا دێنە کونی ژ وورەوەو بۆ ئایش.. یانی ئەمشـەو.. یانی.. گەلـە گورگ.. گورگی چوار پێ..

ئایش : ـ [بـاوەش بە بارامـدا دەکات و دایدەنیشێنێ] بارام.. بارام ئەوە چ خێرتە؟ بۆ وا دەکەیت؟ چیت دی؟ چیت بەسەرهات؟

**بارام** : ـ [هێمن دەبێتـەوە] هیچم نی‌یـە ئایش گیـان، هیچم نی‌یە، کارەساتەکە کەمێك گێژ و وێژی کردم.. بازە.. ئایش بازە.

**ئایش** : ـ بازە؟! بارام چی ڕوویدا؟ بۆمی بگێڕەرەوە

**بارام** : ـ کارەســاتێکی سەیــر بوو، ناچێتـە عەقڵەوە. کە وەك جاری پێشـــوو خۆم مەلاس دایــەوە سەرم سورمــا کە هیــچ ئارمایی‌یەکم نە لەدوورو نە لەنزیك بەدی نەکردو تەنیا هەستم کرد بازە جێ بەخـۆی ناگـرێ‌و بەردەوامیش بەکپی دەمـرێنی، جار ناجـارێـك سووکە تەکانێك بەرەو پێش دەداو دەکشێتەوە. گومـانم لە دڵـدا لا پەیـدا بوو، هاتمـە سەر ئەوەی زیـاتر گوێ

هەڵخەم، گوێ هەڵخستن سووکە خرمە خرمێکی ڕۆیشتنی لەسەربانەوە لا ئاشکرا کردم، لەتەنیشتی لای چەپیشمەوە هەمان سووکە خرمەم کەوتە بەرگوێ. بەلای ڕاستیشمەوە لەو دیو تەیمانەکەوە لمۆزی گورگێم بەدی کرد، سات ناساتێك دەردەکەوت و وون دەبووەوە، هەر دەتووت لەشکرێکی ڕێك و پێکن و هێرش بۆسەر سەنگەرێکی دوژمنەکەیان دەبەن. لەسەربان و تەنیشتی لای چەپەوە خرمە خرمەکە تاڕەهات زیادی دەکردو نزیك دەبووەوە. کۆزەکەی لای ڕاست دەبووە دووان و سیان و پێنج و بەیناو بەینێکی خێراتر دەردەکەوتن، بازە تا دەهات زیاتر سرەوتی لەبەر دەبڕاو تەنگە تاو دەبوو، منیش لەوە زیاتر ئۆقرەم نەگرت، پەلە پێتکەم لەدەمانچە هێنایەوە یەك و ڕووەو لمۆزەکان تەقاندم. بازە [هەناسەکی قووڵ هەڵدەکێشێ] بازە دەست و برد لەگەڵ تەقەکەدا وەك بیەوێ بەپەلە بچێ داخی دڵی خۆی دەربکا، کوێرانە بەرەو لای تەیمانەکە هەڵمەتی برد. هەر هێندەی گەیشتە ناو حەوشە گەلە گورگ لەسەربان و لەتەنیشتی لای چەپەوە وەك گەردەلوولێك خۆیانیان پێداداو تەیمانیان شەق و پەق کردو بەرەو قەدپاڵی گردۆلکەکەی ئەوبەرمان ڕایان ماڵی.. بەئاشکرا دیار بوو گەلە گورگ نیشتوونەتە گیانی بازەو ونجر ونجری دەکەن. لەگەڵ هەر کەلبەیەك کە لەجەستەی بازەیان دەچەقاند وام هەست دەکرد لەجەستەی منی دەچەقێنن.

**ئایش**: ـ شتێکی سەیرە! ئەمە یانی چی؟!

**بارام**: ـ حاڵەتێکی سەیرە! منیش سەرم سوڕماوە، حاڵەتێکە ناچێتە عەقڵەوەو کەچی ڕوویدا.. ژوورەکە زۆر تاریکە لەبەر چاوم، ئەو چرایە بۆ هەڵنایەیت.

**ئایش**: ـ نەوتی تیا نەماوە، ئێستا نەوتی تێ دەکەم.

[ئایش چراکە دادەگرێ تا نەوتی تێ بکات. بارام دەرگای زۆپاکە دەکاتەوە. ئێستا سەر شانۆ جگە لەو ڕووناکیەی لە ئاگری ناو زۆپاکەوە دێتە دەرەوەو دەیدا لەدەم و چاوی بارام هیچ ڕووناکی یەکی تری تێدا نی یە.. دەنگی پێکەنین وژاوە ژاوی چەند کەسێك کە لە مێشکی بارامدا دەنگ دەدەنەوە، ئەوەندەی تر شێتگیری دەکەن.. تارمایی ـ ١ ـ لای چەپی شانۆوە دێتە ژوورەوە، بارام تیشکی لایتەکەی دەگرێتە دەم و چاوی تارمایی ـ ١ ـ]

**تارمایی ـ ١** ـ کابرا تۆ شێت بوویت خۆت بێ عەقڵ مەکە لەو چۆڵەوانیا هەڵناکەیت تۆ وەکو خۆت دەڵێی لەتاو گورگی دوویێ هەڵدێیت و گۆشەگیر دەبیت، ناترسی لەو چۆڵەوانیە گورگی چوارپێ بنێشنە گیانت و ونجر ونجرت بکەن. ئاوایی جەنگەڵستانێکی گەورەیە، دەبێ لە بنچینەوە تێك بدرێ و سەرلەنوێ بنیات بنرێتەوە. [تیشکی لایتەکەی ئاراستەی سەرو چاوی بارام دەکات]

[دەنگی پێکەنینی تارمایی ـ ٢ ـ تارمایی ـ ٢ ـ لای ڕاستی شانۆوە دێتە ژوورەوە بارام تیشکی لایتەکەی ئاراستە دەمو چاوی تارمایی ـ ٢ ـ دەکات]

**تارمایی ـ ٢** ـ کابرا تۆ شێت بوویت و عەقڵت لەگرێ ژەنە چووە، لەخانوویەکی تەریکی دوور لەئاوایدا چۆن ژیان دەبەیتە سەر لەو چۆڵەوانیا بشمرن کەس پێتان نازانێ ئاوایی جەنگەڵستانێکی گەورەیە، دەبێ لەبنچینەوە تێك بدرێ و سەر لەنووێ بنیات بنرێتەوە.

[تارمایی ـ ٣ ـ لەدەرگاکەوە دێتە ژوورەوە، تارمایی ـ ١ ـ و ـ ٢ ـ لایتەکانیان ئاراستەی سەروچاوی دەکەن. ئەمیش ئاراستەی سەرو چاوی بارامی دەکات].

**تارمایی ـ ٣** ـ بارام لەکەلی شەیتان وەرە خوارەوەو خۆت و ماڵ و منداڵت بەفەتارەتێکدا مەدە. لێتان بقەومێ کێ بەهاناتانەوە دێ. ئاوایی جەنگەڵستانێکی گەورەیە، دەبێ لە بنچینەوە تێك بدرێ و سەرلەنوێ بنیات بنرێتەوە.

[هەر سێ تارمایی یەکە لە بارام نزیك دەبنەوەو بەدەوریدا دەسوڕێنەوە]

**تارمایی یەکان** ئاوایی جەنگەڵستانێکی گەورەیە، دەبێ لەبنچینەوە تێك بدرێ و سەرلەنوێ بنیات بنرێتەوە.

**تارمایی ـ ١** ـ وازی لێ بێنن با خۆی تاقی بکاتەوە، قسەکردن لەگەڵیدا فایدەی نی یە، کەسێ نەمرێ دەیبینمەوە. ئەگەر ئەو خەون و خەیاڵانەت هەر زوو هەرەسی نەهێنا هەڵبەتە من هیچم نەزانیوە. [دەڕواتە دەرەوە]

[شانۆ تاریکە. تارمایی ـ ٢ ـ تیشکی لایتەکەی ئاراستەی سەرو چاوی بارام دەکات]

**تارمایی ـ ٢** ـ کابرا تۆ شێت بوویت.. تۆ شێت بوویت..

[بارام پڕ دەکات بەدەمانچەکەیداو ئاراستەی ڕووی تارمایی ـ ٢ ـ دەکات. تارمایی ـ ٢ ـ لایتەکەی دەکوژێنێتەوەو هیچ دیار نامێنێ.. پاشان تارمایی ـ ٣ ـ لە لایەکی ترەوە تیشکی ئ لایتەکەی ئاراستەی بارام دەکات.]

**تارمایی ـ ٣** ـ کابرا تۆ عەقڵت لەگرێ ژەنە چووە.. تۆ شێت

بوویت.

[بارام رووی دەمانچەکەی دەکاتە تارمایی - ٣ - ئەویش لایتەکەی دەکوژێنێتەوەو هیچ دیار نامێنێ ئەم کارەی تارمایی - ٢ - و - ٣ - چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە، تا بەتەواوی بارام شپرزەو شێتگیر دەکەن. ئێستا بارام بەتەنها لەسەر شانۆیەو لایتەکەی داگیرساندووەو بەدەوری خۆیدا دەسورێتەوەو لەدەرەوەش دەنگی تارمایی‌یەکان دێت]

**تارمایی‌یەکانی** ئاوایی جەنگەڵستانیکی گەورەیە، دەبێ لە بنچینەوە تێك بدرێ‌و سەرلەنوێ بنیات بنرێتەوە. [بارام بەدەوری خۆیدا شێتانە دەسورێتەوەو تیشکی لایتەکەی دەدات لە بن میچ و دیواری ژوورەکە تەواو شەکەت و ماندوو دەبێ، بەدەنگێکی بەرز هاوار دەکات]

**بارام:** - بەسە.. بەسە..

[ئایش چراکەی داگیرساندووەو دەچێت بەلای بارامەوە]

**ئایش** بارام گیان.. بارام.. ئەوە چیتە؟ بۆ وا دەکەیت؟

**بارام:** - هیچم نی‌یە ئایش گیان، هیچم نی‌یە.

**ئایش:** - ئێستا بکەین باشە؟ دیارە لەکۆڵمان نابنەوەو دێنەوە وێزەمان.

**بارام:** - گومانم لەوە نەماوە کەدێنەوە، ئەوەیان هیچ. حاڵەتێکی لەرادەبەدەر سەیرەو بەهیچ کلۆجێ رێی تێ‌ناچی‌و لەچارەمان نووسراوە ئێمە تووشی بێین.

**ئایش:** - ئەی باشە بۆچی ئێمە؟

**بارام:** - تێ ناگەم. نازانم بۆچی ئێمە. گوێبگرە ئایش گیان، ئێستا وا سەعات نزیکی چوارە دەبێ زیاتر لە دوو سەعاتی ترمان بەم حاڵەوە بەسەردا تێپەرێ تا شەبەق دەداو لەم موتەکەیە رزگارمان دەبێ. تێمدەگەیت دەڵێم چی؟ دوو سەعات و دەشێ چوار پێنج جاری‌تر هێرشمان بێننەوە سەر. گوێم لێ بگرە بزانە چیم بریار داوەو حەزیش دەکەم بزانم تۆ دەڵێی چی؟

**ئایش:** - تۆ چۆن بریار دەددەیت من وەها دەکەم

**بارام:** - کەوابێ هەڵسەو دەست وبرد بکە، نوێنەکان وئەم هەندە دارەی ژوورەوە نەبێ ئیتر هەرچیمان کەلوپەل هەیە با بیبەین و بەری هەیوانەکەی بەمدیو نایلۆنبەندەکەدا پێ‌بتەنین. چیمان داریش لە هەیوانەکەداو چیمان دارو پەردووش لە ژوورەکەی ئەوبەردا هەیە هەر دەیدەینە پاڵی‌و دەیانکەینە دیوارێك لەروویاندا. تێمدەگەیت دەڵێم چی؟

**ئایش:** - باش تێدەگەم، ئەوسا ئیتر تا بەیانی با هەر بەدەوری قەلاکەماندا بسورێنەوەو بلوورێنن.

**بارام:** - ئا بەڵێ. با هەر کەڵبەشیمانمان لێ تیژ بکەن و تیژ بکەنەوە. ئەمجارە خۆم دەزانم چۆن تۆڵەی بازەیان لێدەکەمەوە.

**ئایش:** - نیازی چیت هەیە؟

**بارام:** - کە بەری هەیوانەکەمان بەمدیوی نایلۆنبەندەکەدا باش تەنی، تەنیا جێگەدەستێك بۆ خۆم دەهێڵمەوە کە بتوانم لوولەی دەمانچەکەی لێوە ئاراستەی دەرەوە بکەم. چەند گوللەم ماوە دەبێ هێندەیان لێ بکوژم.

**ئایش:** - بارام من وای بەچاك دەزانم خۆتیان لێ بێدەنگ بکەیت، چاکتر وایە هەردوو دەرگای ژوورەکانیش قایم بکەین و وازیان لێ‌بێنین تا رۆژ دەبێتەوە.

**بارام:** - مەترسە خۆدێوو درنج نین شالاوم بۆ بێنن وهەرەس بەو هەموو کەلوپەلە بێنن. خێراکە با دەست وبرد بکەین، هاکا هاتنەوە

**ئایش:** - زۆر چاکە.

**بارام:** - با لە پێشدا سندوقەکە بەرینە هەیوانەکە، دەست بەرە ئەو سەری.

[دەست دەدەنە سندوقەکەو بەرزی دەکەنەوە]

## [تاریکی]
## بەشی دووەم

[ ژوورەکە جگە لەو نوێنانەی پێ‌ی دەنوون هیچی تری تیا نەماوە.. دەنگی گەردەلوولەکە نەماوە. ئایش و بارام دێنەوە ژوورەوە.

**بارام:** - بەوەی باشە گەردەلوولەکەشی خستووە.. ئایش گیان ئیتر ترست نەمێنێ. دیوارێکی کونبری وامان لە هەیوانەکەدا دروست کردووە تا بەیانی سەرولمۆزی پیاکێشن هیچیان بۆ ناکرێ‌و نایجووڵێنن.

**ئایش:** - راستە کابرایەکی کەمتەرخەمی، بەڵام کە خەمخۆری بۆ شتێك یەخەی گرتیت بۆی دەبیتە شێری بەرمەیدان.

**بارام:** ـ ئەوەی بۆژیانەکەمان پێویست بێ بۆی دەبمە شێری بەرمەیدان، ئەوەشی پێویست نەبێ بەهیچ کلۆجێ گوێی نادمێ و لەئاستیدا کەمتەرخەمم.

[لوورەی گەلە گورگ دەبیسترێ، بارام و ئایش سەیری یەکتری دەکەن]

**بارام:** ـ با ئەوەندە بلوورێنن تا قورگیان دەتەقێ، ئێمە باکمان بەچییە، دیوارێکی کونبری وامان لە هەیوانەکەدا دروست کردووە تا بەیانی سەرولمۆزی پیاکێشن هیچیان بۆ ناکرێ و نایجووڵێنن، دەبا ئیتر ئەوەندە بلورێنن تا قورگیان دەتەقێ.

[دەنگی لوورەی گەلە گورگ کە نزیك بوونەتەوە]

**ئایش:** ـ لەوە دەچێ هاتبنە حەوشەکەوە.

**بارام:** ـ دیارە. دەزانن بازەوبارام نین و بەئارەزووی خۆیان لەو ناوەدا تەرانێن دەکەن. بەڵام خۆیان دەبیننەوە، با کەمێکی تر بێنە پێشەوەو دڵنیا بین، با بێنە بەر هەیوانەکەوە ئینجا دەچمە وێزەیان.

**ئایش:** ـ من هەر ئەوە بەچاکتر دەزانم کە دەرگاکەش باش قایم بکەین و وازیان لێ بێنین چی دەکەن بیکەن. بارام ئەمانە لەوە ناچێ گورگ بن. ئەگەر گورگ بوونایە بەگۆشتی هاوەڵەکەی خۆیان و بازە تێریان دەخواردو لەکۆڵمان دەبوونەوە یا تەقەکان چاوترسێنی دەکردن و هەر لەم دەوروبەرەش نەدەمان.

**بارام:** ـ ئەی دەبێ چی بن؟!

**ئایش:** ـ دەبێ دێوو درنج بن و خۆیان خستبێتە پێستی گورگەوە.

**بارام:** ـ بەڕاستتە یان بەگاڵتە؟

**ئایش:** ـ وەڵا بەڕاستمە.

**بارام:** ـ [پێدەکەنێ] خۆتۆ باوەڕت بەم بابەتە قسانە نەمابوو.

**ئایش:** ـ ئەی دە نازانم بڵێم چی؟ ئەمانە چۆن گورگێکن؟

**بارام:** ـ هیچ بەهەڵە مەچۆ، گورگی زۆر ئاسیین و بەڵام هێجگار برسین و بۆتێرکردنی ورگێن پەلامار دەدەن و سڵ لە هیچ شتێك ناکەنەوە، گوایە گورگی دوێنێش هەروەها ناکا.

**ئایش:** ـ هەمدیسان بات دایەوە سەربەزمەکەی خۆت. فەرموو بزانە بە چ حاڵێکی گەیاندووین، تۆ ئەگەر ئەوخەیاڵە نەیدایە لە کەللەت بۆچی ئاوەها تووش دەبووین؟

[تەقەی بەربوونەوەی یەکێك لە کەلوپەلەکان دێت. ئایش دڵی دادەخورپێ بارام دەست دەداتە دەمانچەکەی و رادەپەڕێتە سەرپێ، دەرگاکە دەکاتەوەو دەچێت دەرەوە. ئایش دەرگاکەی کردووەتەوەو سەیری بەرهەیوانەکە دەکا.. دەنگی گەلە گورگ دێت.. پاش ماوەیەك دەنگی تەقەیەکی دەمانچەکە دێت.. دەنگی قروسکەی گورگێك.. دەنگی تەقەیەکی تری دەمانچەکە.. دەنگی قروسکەی گورگێکی تر.. دەنگی چەند تەقەیەك.. لوورەی گەلە گورگ دوور دەکەوێتەوەو بارام بەپرتاو خۆی دەکات بەژووردا]

**ئایش:** ـ بارام چی بووە؟ بۆوا بەپرتاو؟!

**بارام:** ـ سەیرە! تۆبڵێی قسەکەی تۆراست بێ؟! ئەمانە دێوو درنج بن؟!

**ئایش:** ـ چی بوو؟

**بارام:** کە چوومە هەیوانەکە، دیار بوو گەلە گورگ لەو دیوەوە پاڵیان بە کەلوپەلەکانەوە دەنا. لە دەلاقەکەوە سەیرم کرد ژمارەیان هێندە زۆر بوو نەدەهاتنە ژماردن. رووەو من لمۆزیان بەرزەکردەوەو کەڵبەیان جیڕ دەکردەوە، نیشانم لەیەکێکیان گرتەوە، بەلادا هات و کەوت، من چاوڕێی ئەوە بووم گەلە گورگ بنیشنە گیانی و ونجڕ ونجڕی بکەن و بیخۆن، کەچی هیچ شتێك لەم بابەتە ڕووی نەدا، بەڵکو تەنیا کردیان بەژێر دەست و پێی خۆیانەوەو زۆر ئاسایی لەسەر شاڵاو هێنانەکەیان بۆ ناو هەیوان بەردەوام بوون. هەر ئەوە بوو عەقڵم تێك نەچێ، تەقەیەکی ترم لێکردن و یەکێکی ترم لێ خستن، ئەویشیان کرد بەژێر پێوەو بەدوایدا شێتگیر بوون و وەك گەردەلوولێك کەوتنە تەکاندان بەنایلۆنبەندەکە. بۆیە وام بەبیردا هات تا نایلۆنبەندەکەیان شڕو وڕ نەکردووەو تا شاڵاویان نەهێناوەتە ناو هەیوان فریای ژوورەوە بکەوم و دەرگاکە توند قایم بکەم.

**ئایش:** ـ چاکت کرد لەوە زیاتر چاوڕێت نەکرد

[بارام بەخێرایی چاو بەناو ژوورەکەدا دەگێڕێ. تەنافی جل هەڵخستنەکە سەرنجی ڕادەکێشێ پەلاماری دەدات، لەتوندو تۆڵی و قایمی تەنافەکە دڵنیا دەبێ. تەنافەکە دەکاتەوە]

**ئایش:** ـ بارام ئەوە خەریکی چیت؟

**بارام:** ـ با لێبمەوە بۆتی باس دەکەم.

[بارام دەڕواتە دەرەوە. سیمای ئایش دەگۆڕێ، ترس و سامێکی زۆر لەڕوخساریدا دەردەکەوێ دەست دەگرێ بە مێشکیەوە. ڕووەو دەرگاکە دەڕوات. لە بن میچی سەرووی

لای ڕاست دەنگی لوورەی گورگێك دێت، بەدوایدا دەمامکی ـ قناع ـ سەرو لمۆزی گورگێك دەردەکەوێت، ئایش دەقژێنێ و بەرەو خوارەوەی لای چەپ ڕادەکات، لە بن میچی خوارەوەی لای چەپ دەنگی لوورەی گورگێك، بەدوایدا دەمامکی سەرو لمۆزی گورگێك دەردەکەوێت، ئایش دەقیژێنێ و بەرەو گۆشەی سەرەوەی لای چەپ ڕادەکات. دەنگی لوورەی گورگێك، بەدوایدا دەمامکی سەرو لمۆزی گورگێك دەردەکەوێت، ئایش دەقیژێنێ و لەوێش هەڵدێ، شپرزە دەبێ، ترس و سام زۆری بۆدێنن، دەکەوێتە سەر ئەرزەکە، بەرەو خوارەوەی لای ڕاست خۆی دەکشێنێ، لەگەڵ قیژەیەکی بەرزدا، بە هەردوو دەستی چاوانی دەگرێ و سەری دادەخات. دەمامکەکان دیار نامێنن، ئایش بەئاسپایی و ترسەوە سەرهەڵدەبڕێ و سەیری شوێنی دەمامکەکان دەکات، کە دەبینێ دیار نەماون ئاهێکی پیا دێتەوە. هەڵدەستێتە سەرپێ، لە پشتیەوە (لە بن میچی خوارەوەی لای ڕاست) دەنگی لوورەی گورگ، بەدوایدا دەمامکی سەرو لمۆزی گورگێك دەردەکەوێت. . دەقیژێنێ و بەرەو سەرەوەی لای ڕاست ڕادەکات، لەوێش دەمامکەکە دەردەکەوێتەوە، لەوێش هەڵدێت و بەرەو گۆشەی سەرەوەی لای چەپ، دەمامکەکەی ئەوێش دەردەکەوێتەوە، دەقیژێنێ، شپرزە دەبێ، دەیەوێ بەرەو خوارەوەی لای چەپ ڕابکات، دەمامکەکەی ئەوێش دەردەکەوێت، بەرەو ناوەڕاستی ژوورەکە ڕادەکات دەنگی لوورەی گەلە گورگ بەبەردەوامی دێن. ئایش ڕوخساری زەرد هەڵدەگەڕێ، گشت جەستەی دە لەرزێ. . لەسەرەوەش (لەسەقفەکەوە) چەند دەمامکێکی سەرو لمۆزی گورگ دێنە خوارەوە. ئەمە ئەوەندەی تر ئایش شپرزەو پەشێو دەکەن. بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوەو نازانێ چی بکات و پەنا بۆ کوێ و کێ بەرێت. . هەناسەی توند دەبێ، ترس و سام هێزی لەبەر دەبڕن. . لەسەر چۆك دەکەوێ، بە هەردوو دەستی چاوانی دادەپۆشێ و هێز لە قوڕگیا دەبێ هاوار دەکات «بارام. . بارام» بارام دێتە ژوورەوە]

**بارام:** ـ ئایش. . ئایش ئەوە چی یە؟ چی بووە؟!

**ئایش:** ـ [سەرهەڵدەبڕێ و بەدەوری خۆیدا هەڵدەڕوانێ. . دەمامکەکانی نەماوەن] هیچ نی یە.

**بارام:** دە برەدارێکم بدەرێ. [ئایش برەدارەکەی بۆ دەبات، بارام بەقەڵەمبڕێك بەر دەبێتە ناوەڕاستی دەرگاکەو هەڵیدەکۆڵێ پاش ماوەیەك کونێکی بچووکی تێ دەکات و سەری تەنافەکەی پیا ڕەت دەکاتە دیوی ژوورەوە. دەرگاکە دادەخات برەدارەکە لەئایش وەردەگرێ و سەری تەنافەکە چاك لەناوەڕاستیەوە دەئاڵێنێ و دەیچەسپێنێتە دەرگاکەو توند گرێی دەدات]

**بارام:** ـ بڕوانە. سەری ئەولای تەنافەکەم توند بەستووە بە ئەڵقەی بنەوەی ئەڵقەڕیزی دەرگای ئەو ژوورەی ئەسپ و بزنەکانی تیایە. ئەمسەریشیم ئاوەها قەدی ئەم برەدارە گرێ داوەو لەدەرگاکەم توند کردووە. ئەوسا ئیتر ئەگەر هەموو گورگی دنیا سەرو لمۆز لەم دەرگا یان لەویان گیر بکەن و بیانەوێ بەپشتیاندا بخەن هیچیان بۆ ناکرێ، چونکە پاڵ بەویانەوە بنێن ئەمیان ڕاگیری دەکاو پاڵ بەمیانەوە بنێن، ئەویان ڕاگیری دەکا. ئیتر شا مەگەر تەنافەکە بپچڕێ و تەنافیش خۆت دەزانیت چەند قایمە ئێستا بۆت ڕوون بووەوە چیم کرد؟

**ئایش:** ـ دەست خۆش. . هەرچەندە هەر دڵم دەگوشرێ ئەوە بێنمە بەرچاوی خۆم هاتبنە ناو هەیوانەکەوە سەرو لمۆزیان بدەن بەدەرگاکەدا.

**بارام:** ـ ئەمە دوا چارەسەرمان دەبێ بۆ خۆپاراستن لە شالاویان.

**ئایش:** ـ سەعات چەندە؟

**بارام:** ـ پێنج و نیوە. هێندەمان نەماوە. هەر کە شەبەقی دا ئیتر وەل دەبن و لەکۆڵمان دەبنەوە. مەگەر بەوە ئەم بەسەرهاتەمان کۆتایی پێ بێت، دەنا هیچ چارەسەرێکی ترمان لەبەردەمدا نی یە.

[تاق و تۆقی هەرەس هێنانی کەلوپەلەکان، ورتەو جوڵە لەئایش و بارام دەبڕێ. دەنگی کەڵبەو چنگ و نینۆکی گەلە گورگ کە لە نایلۆنبەندەکەی گیر دەکەن. بارام خێرا ڕادەپەڕێتە سەرپێ و بە پەلە پرووزێ دەست لەبرەدارو پێچی تەناف و توندو تۆڵی گرێکانی دەکوتێ کە دڵنیا دەبێ دەگەڕێتەوە تەنیشت زۆپاکە. دەنگی ڕژانە ناو هەیوانی گەلە گورگ، دەنگی مرەمرو غەڵبە غەڵب و ئینجا چنگە کرێ و سەرو لمۆزنان بە هەردوو دەرگاکەوە. . بارام دەڕوانێتە دەرگاکە . و

**بارام:** ـ ئەی ئەگەر تەنافەکە بچڕاو دەرگایان بەمدیودا دارماند؟! ئەی ئەگەر شالاویان هێنایە ژوورەوە. [گەلە گورگ دوو سێ تەکانی توند بەدەرگاکە دەدەن. بارام دڵی دادەخورپێ. هەڵمەت دەباتە ناو دەرگەو هەر چوار پەلی

لەمبەرو لەوبەری دیوار گیر دەکات و پشتی پێوە دەنێ] ئاوا.
**ئایش:** ـ بارام ترسی ئەوەت نی یە گەلە گورگ چنگ و نینۆك لە پشتت گیر بکەن؟
**بارام** ترست نەبێ. دەرگاکە تەختە دارگوێزێکی ئەوتۆیە کەچنگ و کەڵبە کاری تێ ناکەن.
**ئایش:** ـ جا دەکرێ تا بەیانی لەسەر ئەو بارە بوەستی؟
**بارام:** ـ چی لە منە؟ تا ڕۆژ دەبێتەوە لەسەر ئەم بارە دەوەستم و فزەی بۆ ناکەن.
**ئایش:** ـ [لەپڕ وەك ترسێکی گەورە لەناخیدا هەڵیدابێ] بارام. ئەی پەنجەرەکە؟ ئەی ئەگەر لەوێوە..
**بارام:** ـ بەراست یانی چی من تا ئێستا لێی بێ ئاگا بووم چی بکەم باشە؟
[بیر دەکاتەوەو چاو بەژ وورەکەدا دەگێڕێ]
**ئایش:** ـ چۆنە منیش وەکو تۆ بکەم، پشت بە پەنجەرەکەوە بدەم؟
**بارام:** ـ نا.. نا. [سەرنجی لەسەر زۆپاکەو بەتایبەتی پارچەکانی لوولەکەی ڕاگیر دەکات]
ئایش هەڵسە خێراکە.. زۆپاکە بکوژێنەرەوە.
**ئایش:** ـ بۆچی؟
**بارام:** ـ تۆ هەڵسە.. دوایی.. خێرا سەرەبزوتەکانی لێ دەربێنەو بیانکوژێنەوە. نا.. نا.. ئاوی پیاکەو خێرا بیکوژێنەرەوە، چاوەرێی ساردبوونەوەی مەکە بەپەرۆیەك پارچەکانی لوولەکەی لێ داگرە خوارەوەو ئاویان پێدا بکە.
[ئایش بارام چۆنی پێ ووت وا دەکات] ووریای خۆت بە.. دەست نەسووتێ.. ئاگات لە خۆت بێ. [ئایش پارچە لوولەکان دادەگرێ]
ئاویان پێدا بکە. [ئایش ئاویان پیا دەکات] وەرە جێگای من. دەتوانیت؟
**ئایش:** ـ دەتوانم.

بارام: ترست نەبێ و نە چنگەکەریکەیان سل مەکەرەوە. تۆ و هەست دەکەیت بەوە دایە لەپشتی تۆی کێل بکەن، بەڵام و نی یە. مەترسەو بەرکە بکرە دارکویزەو هیچیان نە ئەستیدا بێ ناکرێ. نی

ئایش: ـ نی. [دەرواتە شوێنەکەی بارام و پشت دەبی بەدەرگاکەوە] [بارام پڕ بەپارچەلوولەکاندا دەکات و دەیانبات بۆ لای پەنجەرەکە. پەنجیان دەکری بەنستی پەنجەرەکە.
بارام: ـ پڕاو پڕیەتی. [illegible]
لەسەرەوە [illegible] پەنجەرەکە [illegible]
[illegible]
**بارام:** ـ بینیت؟ ئەمەش پەنجەرەکە. هیچی تر ماوە؟ مەگەر دیوار رووخێن بن، دەنا ژوورەکە لەدیوار بەولاوە هیچی تری تێدا نی یە. [دەچێتەوە پاڵ دەرگاکە] لاچۆ بۆ من. [بارام پشت بەدەرگاکەوە دەنێتەوە.] ئایش هەرچی ڕاخەرێك لە ژوورەکەدایە بیهێنە بۆ من.
[ئایش ڕاخەرەکان دەبات بۆبارام. بارامیش لەپاڵ دەرگاکەدا کەڵەکەیان دەکات و لەسەری دادەنیشێ.]
**بارام:** ـ دە تۆش بچۆ وەك من پشت بنێ بەپەنجەرەکەوەو دانیشە.
[ئایش پشت بەپەنجەرەکەوە دەنێ. دەنگی گەلە گورگ و سەرو لموزنانیان بەدەرگاکەدا بەردەوامە. لەپڕ ئایش هاواری لێ هەڵدەستێ]
**ئایش:** ـ هاتن. ئێرەشیان پێزانی.. هاتن [دەنگی سەرو لموزکێشانی گەلە گورگ بەپەنجەرەکەدا]
**بارام:** ـ چی دەکەن بۆمی باس بکە؟
**ئایش:** ـ هەست دەکەم بەبەر پەنجەرەکەدا دێن و دەچن و جار جارێك یەك دووانێکیان دێن، سەرو لموزی پیا دەدەن.
**بارام:** ـ هیچ گوێ مەدەرێ. هەمان بەزمەکەی دەرگاکەیە. هیچ مەترسە. دەترسیت؟
**ئایش:** ـ نەء ناترسم. لەپەنجەرەو لەدەرگاکەش ناترسم.
**بارام:** ـ ئەی ئە؟
**ئایش:** ـ نازانم.. لەشتێك دەترسم کە نازانم چی یە.
**بارام:** ـ ئایش گیان خۆت مەشلەژێنە، یانی مەبەستم ئەوەیە بڵێم خۆت مەترسێنە، تۆخۆت دەترسێنێت تۆ دڵنیایت کە هیچیان بۆناکرێ و ناتوانن زەفەرمان پێ بەرن، ئیتر بۆچی دەهێڵیت ترس زۆرت بۆ بێنێ؟ کاتمان گەیاندووە بەنزیکی شەش، هێندەمان نەماوە، هەر هێندەی شەبەقی دا ڕزگار دەبین، تین بدەرە بەرخۆت و ورە بەرمەدە. ئەوەتا دەبینیت چۆن ژوورەکەمان لێ کونبڕ کردوون، خۆ دیوارەکان کون ناکەن.
**ئایش:** ـ ئەی ئەگەر شەبەقی داو بەرۆکیان بەر نەدایـن؟
**بارام:** ـ [وەك ئازارێکی زۆری پێ گەیشتبێ ڕوخساری

دەگۆڕێ‌و دەشێوێ، دەست دەگرێ بەسکیەوە]
**ئایش**: ـ [دڵی دادەخورپێ] بارام. چ خێرتە؟
**بارام**: ـ هیچ نی یە، وا تێدەگەم سەرما کاری تێکردووم، پێچی ژانێکی تیژ بەناو سگمدا رابوورد، [ئایش هەڵدەستێ‌و دەیەوێ بچێت بۆلای بارام] هیچم نی یە، خێرا بگەرێرەوە جێی خۆت.
[ ئایش دەگەرێتەوە جێی خۆی. بێدەنگی... دەنگی هات وچوی گەلە گورگ وسەرو لمۆزکێشانیان بەدەرگاو پەنجەرەدا نامێنێ. ]
**ئایش**: ـ [گوێ قوڵاغ دەبێ] بارام. جم وجوڵیان نەما. ئەو دیو پەنجەرەکە تەواو خامۆشە.
**بارام**: ـ منیش. لای منیشەوە وەهایە. سەیرە! [سەیری سەعاتەکەی دەکات و سەرسام دەبێ]
**ئایش**: ـ تۆبڵێی شەبەقی دابێ؟
**بارام**: ـ [هەڵدەستێ‌و لەکونی تەنافەکەوە سەیری دەرەوە دەکات] هێشتا دنیا تاریکە.
[دادەنیشێتەوەو پشت لەدەرگاکە توند دەکاتەوە] ئایش پیلانە، پیلانەو هیچی تر باوەر بەو بێدەنگیەیان مەکە. پشت لەپەنجەرەکە توند بکەو بەهیچ کلۆجێ بەری مەدە
**ئایش**: ـ [دەترسێ] یانی تۆبڵێی نەرۆیشتبن؟! یانی...
**بارام**: ـ [وەك بیەوێ ترسەکەی ئایش برەوێنێتەوە] رەنگیشە بێزار بووبن و رۆیشتبن، ئەمەشیان دەبێ‌و خوا بکا وابێ.
**ئایش**: ـ خوا بکا.
**بارام**: ـ باری دانیشتنەکەت ماندووی نەکردوویت؟ ئەگەر دەزانیت نارەحەتە با چارەسەرێکی بکەم.
**ئایش** نەء پێویست ناکات باشە.. بەلام قاچم سربووە.
**بارام**: ـ تۆزێ بیانجوڵێنە.. یا بەنۆرە قورسایی‌یان بخەرە سەر.
**ئایش**: ـ ژوورەکەش خەریکە تەواو سارد دەبێتەوە.
**بارام**: ـ ئەگەر سەرماتە با پاڵتۆکەمت بدەمێ لەبەری بکە.
[پاڵتۆکەی دادەکەنێ‌و فرێی دەدات بۆئایش، پاڵتۆکە ناگاتە ئایش، هەردووکیان لەیەك کاتدا هەڵدەستن پاڵتۆکە هەڵگرن، گەلە گورگ پەلاماری دەرگاو پەنجەرە دەدەنەوە، ئایش و بارام واز لەپاڵتۆکە دێنن و پشت دەنێنەوە بەدەرگاو پەنجەرەکەوە. گەلە گورگ بەتوندی سەرو لمۆز دەکێشن بەدەرگاو پەنجەرەکەدا، ئایش و بارام دڵەکوتێیان پێ کەوتووە، ئایش تەواو شپرزە بووەو دەلەرزێ، بارام بەحاڵی ئایش دەزانێ‌و ورەی دەداتەوە بەر]
**بارام**: ـ ئایش ئەوە چی‌یە؟ دەترسیت؟ ئایش گیان مەترسە، هۆشت لەسەر خۆت بێ‌و بەسات ورە بەر نەدەیت، دەمەوێ بزانیت کە ورە بەردان دەبێتە هۆی بە گورگان خواردوو چوونی هەردووکمان. ئینجا حەز دەکەم ئەوەیش بزانیت کە من تەنیا یەك پشتم هەیەو ئەوەتا ناومە بەدەرگاکەوە، لەکاتێکدا ئێمە پێویستمان بە دوو پشت هەیە کە دووەمەکەیان پشتی تۆیە. تێمدەگەیت دەڵێم چی؟
**ئایش**: ـ تەواو. خەمت نەبێ‌و نەبێ‌و ترست لێم نەبێ. مەگەر پشت و سنگم کون بکەن و لەوێوە خۆیان بگەیەننە ناو ژوورەکەوە.
**بارام**: ـ تەواو. منیش تەواو، نە خەمم لەدڵدا ماو نەترس.
**ئایش**: ـ [لەپر هاوار دەکات] بارام گوێت لێ بوو؟
**بارام**: ـ لە چی؟
**ئایش**: ـ شووشەیەکی پەنجەرەکەیان شکاند
**بارام**: ـ باشتر. کە لمۆزی پێدا دەدەنەوە دەم وقەپۆزیان برینداردەکا، ئەی هیچ هەست بەوە دەکەیت دەمیان بگاتە کەلوپەلەکان و رایکێشن؟
**ئایش**: ـ نەء.
**بارام**: ـ دە هیچ گوێ مەدەرێ شووشە شکاندنەکەش دادیان نادا.
[گەلە گورگ بەردەوامن لەسەر لمۆزکێشان بە دەرگاو پەنجەرەدا. پاش ماوەیەك لەپر خامۆشیەکی سەیر باڵ بەسەر ناو هەیوان و پشت پەنجەرەکەدا دەکێشێ. ئایش و بارام گوێ قوڵاغ دەبن و سەیری یەکتری دەکەن]
**ئایش**: ـ دەنگیان نی یە. سەعات بووە بەچەند؟
**بارام**: ـ [سەیری سەعاتەکەی دەکات] سەعات لەشەش تێپەری کردووە.
**ئایش**: ـ لەوە دەچێ رۆیشتبن.
**بارام**: ـ نابێ. لەپر بێدەنگ بوون.. بۆچی وا لەپر؟
**ئایش**: ـ تۆبڵێی بمانخەڵەتێنن؟!
**بارام**: ـ دەشێ وەك جاری پێشوو.. بەلام هیچ ترست نەبێ. دەرگاو پەنجەرەکەم بەجۆرێکی وا قایم کردووەو تەنیوە ئەگەر

گەلـە گورگە.دە ئەوەنـدەی تریش بن لە ئاستیـانـدا هیچیـان بۆ ناکرێ جگە لەهێنانە خوارەوەوی دەم و قەپۆزی خۆیان.

**[دەنگی گەلە گورگە. هەموو پێکەوە، لەیەك ساتدا بە هەرچی تین و توانـایـەکـەوە کە لە قورگیـاندا هەیە دەکەونە لووراندن و قروسکاندن و زریق وزاقیکی زۆر، بەڵام سەرولمۆز ناکێشن بەدەرگاو پەنجەرەدا. بارام و ئایش پشتیان لەدەرگاو پەنجەرەکە تونـد کردووە. قاوو قیـژە گوێ کەرکـەرەکـەی گەلـە گورگ لەپرێکدا کپ دەبێ. بارام و ئایش بەسەرسورمانەوە دەروانـنە یەکتـری. گوێ قولاغ دەبن. کپ وخامـۆشی باڵ بەسـەر ناو هەیوان و پشت پەنجەرەکەدا دەکێشێ]**

**ئایش: ـ دەبێ چی بێ؟! ماون یا رۆیشتوون؟!**

**بارام: ـ نازانم، منیش سەری لێ دەرناکەم، سەیرە!**

**ئایش: ـ ئەی چار چی یە؟ چی بکەین؟**

**بارام:** ـ با ماوەیەکی تریش چاوەڕێ بکەین، بزانین چی دەبی

**ئایش:** ـ رەنگە شەبەقی دابێ.

**بارام:** ـ رەنگە.

**ئایش:** ـ ئەگەر شەبەقی دابێ توبلێی رویشتبن ● ئەی ئەگەر نەرویشتبوون؟

**بارام:** ـ ئەگەر نەرویشتبوون ئەواکوتایمانەو برایەوە.

**ئایش:** ـ دە تو چاوی بنی بە کونەکەوە.. بزانە چی یە

**بارام:** ـ [چـاو بەکـونـەکـەوە دەنی.. بە گەشکـەداریـە هاوار دەکات] ئایش دنیا رووناکە.

**ئایش: ـ [دەگەشێتەوە] ئەی گەلە گورگە؟**

**بارام: ـ گەلە گورگە نەماون. تەواو. رزگارمان بوو.**

**ئایش: ـ دەتـرسـم ئەمـەش پیلان بێ. دەترسم لە پێچ وپەنای هەیوان و حەوشەکەدا خۆیان بۆ مەلاَس دابین.**

**بارام: ـ بێنـەو بەرەی بۆچی یـە. دەرگـاکـە دەکەمەوەو سەرێك دەبـەمـە دەرەوە تا بەیـەکجـاری دڵنیـا بێن. [سـەری تەنافەکە لەبـرەدارەکـە دەکـاتـەوە.. خەریـك دەبێ دەرگـاکە بکاتەوە، ئایش هاواری لێ دەکات]**

**ئایش: ـ بارام. ئاگاداری خۆت بە.**

**[ بارام دادەچڵەکێ.. زۆر بەووریـایی و ترسـەوە دەرگـاکـە دەکاتەوە، دەستی بە دەرگاکەوەیەو سەری بردووەتە دەرەوە. بە راست وچەپی هەیـوانەکەدا هەڵدەڕوانێ، دەست لەدەرگاکە بەر دەدات و دەڕواتە دەرەوە.. لە دەرەوە هاوار دەکات]**

**دەنگی بـارام** ئایش. تەواو.. رزگـارمـان بوو.. گەلـە گورگ نەمـاوە. [دێتـەوە ژوورەوە] ئایش گەلـە گورگ نەمـاون.. رزگارمان بوو.

**[ئایش وەکو گوڵ دەگەشێتەوە، پشت لەپەنجەرەکە بەردەدات، لەبارام نزیك دەبێتەوە]**

**ئایش:** ـ ئەمـە بوو ئەو جیهـانە پاك وجوانەی بنیاتت نا؟! ئەی ئەو جیهانە پاك و جوانەی تو بنیاتت نا

**بارام:** ـ [پـالتـوکـەی هەڵـدەکریتەوەو لەبەری دەکات.. دوو دەکاتە ئایش، دەنگی ئارمایی یەکان لە میشکی بارامدا دەنگ دەدەنەوە]

**دەنگی ئـارمـایی یـەکـان:** ـ ئاوایی جەنگەستێکی گەورەیە، دەبی لەبنچینەوە تیك دری و سەرلەنوی بنیات بنریتەوە.

**بارام:** ـ ئایش. ئاوایی چەنگـەستـێکی گەورەیـە دەبی لە بنچینـەوە تیـك دری و سەرلـەنـوی بنیـات بنریتەوە. [دەستی ئایش دەگـری و دەڕوبـە دەرەوە] [پاش ماوەیەك دەنگی حیلەی ئەسپـەکـە.. پاشان دەنگی حرم و هوری سمی ئەسپەکە لە دوور دەکەویتەوە...

**[کوتایی]**

**سەربج**

کومـەڵـەی هونـەرە جوانـەکـانی کورد ـ دەستـەبـەنـدی کتێبی سلیمانی، ئەم شانویی یەی:

- یەکـەم جار لە چوارچێـوەی دووەم فیـسـتیفـاڵی شانـۆیی پەیمـانگـەی هونـەرە جوانـەکـانی سلێمـانی کە لە ١/٤ ـ ١٩٨٨/٤/٧ سازکـرا، لە هۆڵی سانـەوی سـەلاحەدین پێشکەش کرد.
- دووەم جار لە ٧/٩ ـ ١٩٨٨/٧/٣١ بۆ جەمـاوەرری شاری سلێـمـانـی پێشکەش کرایەوە.
- سێـیـەم جار لە ١/٤ ـ ١٩٨٩/١/٧ لە شاری هەولـێـر، لە سەر شانـۆی رۆشنبیری جەماوەر پێشکەش کرا.
- ئەم هونـەرمـەنـدانـە بەشداریان تێداکرد: شەماڵی عەبە رەش، شادان فوئاد، محـەمـەد ئەحمـەد، کەمـال جەلال، بورهـان عومـەر، خالـد رسـوڵ، سەردار خەلیل، دڵشاد ئەحمەد، نەجم هوگر، حسین قرداغی، غەفور عەبدوڵا،
- شانۆیی یەکە لە دەرهێنانی ئامادەکار خۆی بوو.
- چوارەم جار لە رۆژانی ١٥و١٦/٣/١٩٨٩ لە هۆڵی کومـەڵـەی رۆشنبیری کوردی لە بەغدا پێشکەش کرا.




هەفتەیەك زیاترە، هەر ئەو کاتەوە تووشی هەلامەتیکی تیژ ی کرد! لەناو نوینەکەی دا هەلنەستووەتەوە. شوکریەی سیستەریش، هەموو ئیوارەیەك سەری لی دەداو دەرزی‌یەکی پەنسلینی لەرانی دەچەقینی و هێندی دەرمانی پێویستیشی دەداتی. ئەمەش جاری یەکەم نی‌یە، کە تووشی هەلامەت و کوکەو سینگ ئیشان دەبێت؛ بگرە هەر کاتێك وەرزی زستان لەگەل خۆیەوە، سەرما سەختەکەی و باو بارانی بەتەوژمی تەزینەر بینێت، ئەو یەکسەر نەخۆش دەکەوێت و ئاوەکانی دەسووتێنەوەو وەکو دوو تۆپی ئەسفەنج سوور دەئاوسێن و رێگای هەناسە وەرگرتنی لی دەگرن... ئینجا هەست بەتاو لەرزو دارزانیکی تەواو دەکات، کە هەموو لەشە لاوازەکەی دادەگرێت.. هەر لەتەمەنی حەوت سالی‌یەوە، ئەوەیە حالی، ئەو ساکە نەدەچوو خەستەخانەو چاوی بە هیچ پزیشکێکیش نەدەکەوت؛ چونکە داپیرەی لە چارەکردنی ئەم نەخۆشیانە گەلێك پسپۆر بوو... پەنجەیەکی بۆ گەرووی درێژ دەکردو بەتوندی لە ئالوە ئاوساوەکەی دەچەقاندو کە دەری دەهێنا، کێمێکی زەرد دای دەپۆشت. سیستەرەکە، دەرزی‌یەکەی لەرانی دەرهێناو پێی گوت:

- وادیارە، بەتەواوی چاك بوویتەوە، ئەمەیان دوایین دەرزی بوو، لەرانم چەقاندی.

- شوکریە خان، زۆر سوپاست دەکەم، هونەرەکەش هی تۆیە. فەرهاد، زەردەخەنە گرتی و لەجێگاکەی هەلسایەوە، سەرنجێکی تیژی ئاراستەی، سینە پڕەکانی سیستەرەکەی کردوو تۆزێکیش لە دوو چاوە رەشە فراوانەکانی راما، کە زۆر بەخۆشیەوە سەیری دەکرد!... لەم حەوت رۆژەی رابوردوودا، شوکریە تەنها بۆی سیستەر نەبوو، بەلکو ئەو ئەرکەی خستبوویە ئەستۆی خۆی، گەلێك لەوە زیاتر بوو؛ بە پەنجە نەرمەکانی بە سۆزی، بە قسە خۆشەکانی، تیشکێکی خۆشنوودی دەخستە دلیەوە ـ کە ئەو رادەکشا، ئەویش لە تەکیەوە. لە قەراخ قەرێولەکەوە دادەنیشت، بەدەسەسرێك رێچکەی عارقەی نێوچەوانی دەسری‌یەوە. بە پەرداخ ئاوی دەکردە قورگی و پێش برکێی لە گەل دایکەکەی دەکردو لەو زیاتر خزمەتی دەکرد. دایکەکەی بە شەرمەوە دەی گوت:

- کچم، بۆخۆت ئەزیەت دەدەی، خۆمن هێشتا توانای ئەوەم ماوە خزمەتی بکەم.. لەم دونیایە لەو زیاتر کێم هەیە؟!.

- جا پلە، ئەو قسەیە بۆ ئەکەی.. ئەی منیش خزمی خۆتان

شوکسە بەراستی خزمی دایکی بوو، بەلام خزمێکی دوور. کچێکی روو خۆش بوو، پێکەنین روخساری بەر نەدەدا، قسە شیرینەکانی دەچوونە دلەوە، هەمیشە هەولی ئەوەی دەدا، بۆ هەر کەسێك بی ناسیبایە، یا روو بە رووی ببوایە، دەستی یارمەتی لە بواری پیشەکەی خۆی، بۆ درێژ بکات، ئەگەر ئەوەش نەبوایە بە زەردەخەنەیەکی گەشاوە پێشەوازی دەکردو ئەم زەردەخەنەیەش، تیشکێکی پرشنگداری لی هەلدەستاو دەموچاوە ناشرینە خوریکەواویەکەیی و لووتە درێژە چەماوەکەی دادەپۆشی.

فرهاد پێش نەخۆشیەکەی ئاشنایی لە گەل کچە نەبوو. بەلام کە چاك بۆوە، کچە چەند جارێك بۆ مالەکەیان دەعوەتی کردو گەلێك جاریش ئیواران دەهاتە لای دایکی و چاویان بە یەکتری دەکەوت.. کورە ئەوە تێگەیشت کە کچە تۆری بۆ داناوەتەوەو گەرەکیەتی بی خاتە ناوەوەی کچە هێشتا جحێلە، لەوانەیە تازە لە تەمەنی سی سالی رەتی کردبی؛ بەلام سەوادی شووکردن بە تەواوی لە کەللەی دابوو، وای لی کردبوو، کە گەلێك جار هەنگاوی ئەحمەقانە بنێت و ئەنجامەکەشی مسوگەر نەبێت، واشی لی کردبوو، کە پەیوەندی لە گەل چەند گەنجێکی وا ببەستی. کە مەبەسیان هەر رابواردن بوو!.

دەشبی کارکردنی لە خەستەخانە ئەم جۆرە بارو دۆخەی بۆ رەخساندبی، دەرفەتێکی وای خستبێتە بەردەم، کە خەلکێکی زۆر بدینی و پەپوەست بێت لە گەلیانا..! چەند جارێك لە ئەنجامی حەزلی کردنەکانی، تووشی هەناسە ساردی هات،

ئەوەشی دەزانی، کە دەموچاوە ناشیرینەکەی هۆی رەوینەوەی لاوەکان بوون لێی.. هێندەی نەما بوو رەشبینی هەرەسی پێ بێنێت، چەند جارێکیش بیری لە خۆکوشتن کردەوە!. هەموو رۆژێك لەبەر ئاوێنەکە دادەنیشت و سەرنجی دەدایە دەموچاوە سیس بووەکەی، لەناو قژە رەشە براوە کورتەکەی دا، لە داوە سپی یەکان دەگەڕا، بەڵام کە کراسەکەی بەری دادەکەندو بە خۆشنوودی یەوە دەی ڕوانی یە سینە سپی یە نەرموڵەکەی، جووت مەمکەکانی کە هەروەکو دوو تۆپی فوو دراو بوون وەدەردەکەوتن و لە گەڵ هەر جوولەیەکی ی دەلەرانەوە؛ هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا هەواکەی سینگی بە توندی دەردەپەراند، هەستی بە گوشادی یەك دەکرد، دەخزێتە هەموو خانەیەکی لەشیەوە، وای هەست دەکرد، کە هێشتا لە تافی جحێلی ی دایەو دەش توانی بەو مەرامەی لە مێشکی دا گینگل دەخواتەوە بگات!.

فەرهاد هێشتا تەمەنی لە بیست وپێنج ساڵی دا تێپەری نەکردبوو، هەر چەندە لە ڕواڵەتەوە شەرمن دیار بوو؛ بە تایبەتی بەرامبەر ئافرەتان، بەڵام دەروونی وەکو بورکانێکی تەقاوە جۆشی دەدا، هاواری سێکس زۆر بە توندی تێی دا دەنگی دەدایەوە، هێزێکی گەورەو کاریگەری شاردراوە، بەرەو کچەکە پاڵی پێوە دەنا... لە یەکێك لە سەردانەکانی، چاوی بە کچە کەوت، کراسێکی تەنکی جوانی لەبەر بوو، هەموو ئادگاری لەشی دەبیندرا؛ دوو بازووە درێژ و نەرموڵەکانی بە تەواوی ڕووت دیار بوون، کراسەکەش بە تەواوی سینە پان و بەفرینەکەی دانەدەپۆشت؛ جووت مەمکە گەورەکانی لەژێر ئەم کراسە تەنکەدا بەچاکی دیار بوون. بەشەرمەوە لە سەر دۆشەکێك دانیشت، کچە بالیفێکی گەورەی خستە پاڵیەوە، ژوورەکە هەمووی بە مافووری ڕەنگین رایەخەسترابوو، بە درێژای دیوارەکەش دۆشەکی پەمۆ ریز کرابوون و پەشمەی جوانیشی بەسەردا هەڵ کێشرا بوون. کچە بەبێ شەرم، دەستە لەرزیوەکەی گرت، تیشکێکی گەشاوەی زەردەخەنەیەکی پڕ لە خۆشنودی بەسەر دەموچاوی دا بەرەڵا کردو بەنازەو گوتی:

ـ گیانەکەم، بۆوا درەنگ هاتی؟!. من هەر خواردە مەنی یەك حەزی لێ بکەی، بۆم ساز داوی!. فەرهاد لەبەر وشەی «گیانەکەم» راچڵەکی، لە دڵی خۆی دا پرسیاری کرد: «بەڕاستی من گیانی ئەوم؟!».

هەرچەندە زستانێکی سەخت بوو، بەڵام ژوورەکە بەهۆی سوپا نەوتیەکان گەرم و گوڕ بوو، لە دەرەوە گرمەی هەورە تریشقە دەنگی دەدایەوە، تروسکەی برووسکەکان لەپشت پەردە تەنکەکەی تاکە پەنجەرەکەی ژوورەکەوە بە دی دەکرا.. کچە بۆ نان هێنان. هەڵسا خوشکەکەی لەو بچووك تر، نایلۆنێکی زلی لە نێوەند ژوورەکەدا رایەخست. فەرهاد لە ژێرەوە سەرنجێکی تیژ و کورتی دایێ: کچە لەتافی جحێلی دا بوو، بەژن و باڵا درێژ و شۆخ و شەنگ و قەد باریك بوو، دەموچاوێکی پەری یانەی دڵگیری هەبوو، بە هیچ جۆرێك بە خوشکەکەی نەدەچوو، کچە کە چەمایەوە، دوو دەسك لەپرچە قاوەیی یەکەی بە سەر شانی دا شۆر ببوونەوە، بە دۆش دامانەوە لە خۆی پرسی: «چۆن لە جارانی پێشوودا چاوم پێی نەکەوتووە؟!». شوکریە کە گەڕایەوە. جەند دەفرێکی پڕ لەخواردەمەنی هەڵ گرتبوو، لەسەر سوفرەکە ریزی کردن، بە زەردەخەنە یەکی کزەوە گوتی: ـ ئەمە گوڵچنی خوشکمە.. هەر پێش دوو ڕۆژ گەڕاوەتەوە، ماوەیەك بوو لای خوشکە گەورە شووداره‌کەم بوو. دایکەش لە مەتبەقەکەوە گەڕایەوەو بەرامبەریان دانیشت تیلەی چاوی لە روخساری هەڵ نەدەگرت؛ لەوانەیە وابیری کردبێتەوە، کە رۆژ یك دێ ببێتە زاوایان!. کە لە نان خواردنی ئێوارە بوونەوە، فەرهاد بە گەرمی سوپاسیانی کرد. بە دەمێکی پڕ لەپێکەنینێکی خۆشنوودی یەوە گوتی: ـ بەڕاستی خواردەمەنیەکی زۆر بەتام و چێژ بوو!.

شوکریەش یەکسەر وەڵامی دایەوە:

ـ نۆش گیانت بێ.. رۆژێك دێت ئەوە ببینی چۆن ئەم دەستانەم خواردەمەنی گەلێك خۆش و بەچێژترت بۆ دروست بکەن!.

پاشان کچە بەپێکەنینەوە گوتی:

ـ یاری «کۆمکان» دەزانی؟

فەرهاد بەشەرمەوە وەڵامی دایەوە، بەسەرنجێکیش دەموچاوی دایکەی پشکنی یەوە، کەئەویش بە وردی تێی رادەما، پاشان تیلەی چاوی دایە گوڵچن، کە لەپشت سەماوەرەکەی هەڵمێکی چڕی لێ هەڵدەستاو لە بۆشایی ژوورەکە بڵاو دەبۆوە، دانیشت بوو، خەریکی چا تێ کردن بوو:

ـ ئا.. کەمێکی لێ دەزانم.

ـ دەتەوێ، پێکەوە یارییەکە دەست پێ بکەین؟! پێش ئەوەی

فەرهاد وەڵام بداتەوە، کچە گوتی :

ـ بەڵام من لەوە دڵنیـام، کە هەر تۆ دەی دۆڕێنی . کاغـەزەکانی یاری یەکەی گرتە دەستەوەو بەدەست و برد تێکی هەڵ کێشان و پاشـان دابـەشی کردن وگەمـەکـە دەستی پێ کـرد کچـە کە لە دووچـاوە ڕەشـە گەورەکـانی کوڕەو دەمـوچـاوە فرە جوانـەکەی ڕادەمـا، هەستی بە کامـەرانی دەکـرد، گیانی دادەگرێت، کە بیشی دوانـدابـایـە، قسـەکـەی بـەوشـەی «گیـانەکەم» دەست پێ دەکـرد. . کاغـەزەکـانی لە دەست دەرفـانـدو سەرنجێکی دەدانێ، پاشان بە پێکەنینەوەپێی دەگوت :

ـ گیـانـەکـەم، ژمارەکان دەبێ ل. دوای یەکەوە بێ . . ئا «پێر» بەم جۆرە درووست دەکـری . . ! تێگـەیشتی . . ؟! ئەویش بە شەرمەوە وەمی دەدایەوە :

ـ ئا . . ئازیزەکەم تێ گەیشتم . . !

بەڵام هەر لەو کاتـەوە، کە چاوی بەگـوڵـچـن دەوت، مێشکی بەوەوە جەنجـاڵ بوو، کچـە لە ژێـرەوە تیلەی چاوی تێ دەبـری و ئەویش هەر چەنـدە بە یاری یـەکەوە خەریك بوو، سەرنجێکی خێـرایی دەدایێ و، بەڵام تێـروانینـەکـانی تیژ و پشکنـەر بوون؛ چاوەکـانی وەکـو کامیرایەکی تۆماتێك دەیان وێنـەی لە چرکێـك دا دەگـرت، ئەم وێنانەش بە بێ گەردی لە مێشکی دا نەخشـەی دەکێشـا . . چاوەکـانی گوڵچن وەکو هی شوکـریـە گەورە بوون، بەڵام وەکـو هی ئەو ڕەش نەبـوون . . زەرد بوون، تیـشـکـێـکـی پرشنگـداری وەکـو تیشکی ڕۆژ لێ دەدرەوشـانـەوە، دەمـوچـاوی وەکو مانگی لە چواردە، خڕو ڕەنـگ زیـوین؛ لووتێکی بچووك و دوولێوی ناسك و تەنك، کەخـەنـدە دڵـرفینـەکـانی لە یەکی دەتـرازانـدن، ددانـە وردیلەکـانی، وەکـو دوو ڕشتـەی مرواری سپی، لە ناو دەمـە بچـووکـەکەی دا بەدەردەکەوتن . . کراسێکی سووری ڕازاوەی بە وردەگـوڵی ڕەنگـاو ڕەنگی لەبەر بوو، ئەنگوچکە درێژەکانی لەیـەکی گرێ دابوون و خستبوینە سەر شانی و بەشێکی زۆری لای دەسـتی هەڵ کشـابـوونـەوە سەرەوەو دوو بازووە سپی و نەرمـۆڵـەکـانی، کە بەریـزە بازنی زێـر ڕازانـدبـوویـەوە بەدەرکـەوتبـوون . لە جێگـاکـەی دا هەڵسایەوەو پیاڵە چایەکی خستـە بەردەم، بە توورەیی یـەوە لە خوشکـەکـەی خوڕی : ـ ئەرێ یاری کردن بەس نی یە؟!

فەرهاد یەکسەر بەرەو پشتەوە کشایەوەو پاڵی بەبالیفەکەوە ناو پیـاڵـە چایـەکەشی بە دەستێکی هەڵ گرت و بە دۆش داماوی سەرنجی دایێ، بەڵام کچـە بزەیێکی پرشنگداری خستە سەر لێـوەکـانی و دەمـوچـاوی وەکو ڕۆژێکی بەرەبەیان گەشاندەوە، چاوەکـانیـانیشیان لەیەکتری چەقان و بە دوورو درێژی لەیەك ڕامان . کوڕە هەستی بە پێگێکی گەرم کرد بە تەنی دا دەڕوات شوکریەش پاپەزەکانی تووڕهەڵداو کشایەوە پاشەوە، دایکەش کە سەرەنجی دەدانێ ؛ نیشـانەی پەستی و توورەبوونی لە سەر ڕوخساری شوکریەی کچی بەدی کرد! . . ئەوشەوە کاتێکی خۆشـی لەگـەڵـیـانـا بردە سەر. کە لە نیـوەی شەودا بەجێی هێشتن، دوو خوشکـەکە تا دەرگای حەوشە بە ڕێیان کرد، ئەویش لە پاڵتۆکەدا خۆی لوول داو ویستی خۆی لە نمە بارانـەکـەی بە هێمنی دەهـاتـە خوار بپـارێزی . . ئیتر هەر لەو شەوەوە بیـری لە گوڵچن دەکـردەوە؛ ئەم کیـژ ۆڵـە ناسـك و نازدارە، بوو بە وێنـەیـەکی ئەفسـووناوی لە پەردەی مێشکی خۆی دەتـوانـد، بووە هانـدەرەکی بەهێـز پاڵی پێـوە دەنـا، کە هەزارو یەك بیـانـوو بۆ خۆی بدۆزێـتـەوە بۆ ئەوەی سەر لەمـاڵـەکـەیـان بداو، ئەو ماڵـەی لێی بـووە شوێنێکی پیـرۆزو پەرستگـاییـك، کەپـەیکـەرە جوانـەکـەی خەونـەکـانی لێ دانـدرابـوو. بەڵام شوکـریە، گەلێك لە خۆی پێی خۆش تر بوو تا لە هاتنە لایان دانەبڕێت، بۆیە خۆی دەعوەتی دەکردو، ئاواتێکی زۆریشی بەم هاتنـانانەی هەبوو. گەلێك جار لەگەڵ خۆیـەوە وای بیـردەکـردەوە، کە ئەم داوەی بۆی دانـاوەتـەوە، هێنـدە پوختـەیـە هەر ئەوەی ماوە بە تەواوی بکـەوێتە ناوی . . بەبێ ئارامی چاوەڕوانی ئەم وشـە ئەفسـوونـاوی یـە بوو، کە خەونـە هەمیشـەییکـەی ژیـانی پێ بهێنێـتـەدی . بەڵام ئەوەی ڕووی دا، بە پێچەواتەی ئاواتەکەی ئەو بوو؛ ڕۆژگار وای کرد، دڵـداری یەکی قووڵی بەسۆز لەگەڵ گوڵچنی خوشکی ڕێسەی بەکپی بهـۆنێتـەوە، تێ ڕوانینی حەزو، قسـەو گفتـوگـۆیـەکی بێ پایانی عیشقی چاوان، ببێتە گڵپەی ئاگرێکی بەجۆشی ژێر پەراسـووەکـانیـان، کار گەیشتـە ئەورادەیەی خوشکە گچکە، هەر کاتێـك فەرهـادو شوکـری یـەی خوشکی بدیبـایـە، پێ دەکـەنن و یاپێکـەوە یاری یـەکـە دەکەن، پەست ببێ و یا لە توورەییـا بە ڕوویان دا بتەقێتەوەو ژوورەکە جێ بهێڵی . . هەر وەهـا دایکـەش کەوتە دوودڵی و ڕاڕای، بەتایبەتی کە خەمێکی چڕی بە ڕوخسـاری کچـە گەورەکـەیـەوە دەدی، لەوەش دەتـرسـا، نەوەك جارێکی تر تووشی ئاوات ڕوخـان ببێ و لێی ببێ بەزەبرێك خۆی پێ لەبەر ڕانەگیرێ! . . . شەوێکیان پاش ماوەیـەکی درێـژی یاری (کۆمکان)، فەرهاد ویستی بڕوات، ئاسمان ساف و بێ گەرد بوو، مانگ لە چواردە بوو، بە هێمنی دەخـزیی و تریفـە کزەکـەی بەرەو باخچە بچکۆلانەکەی ماڵیان شۆڕ دەبـۆوە، گوڵچن بەدوای داهـات، لە ڕێـرەوەکـەی کە بۆ

دەرگـای حەوشـە دەچـوو، لە تەنیشتی یـەوە دەرۆیشت، لەپـڕ دەستی بەرانی فەرهـاد کەوت! ، فەرهـادیش ئاورێکی لەدواوە دایـەوە، کەسی تـری بەدی نەکـرد؛ ئەویش دەستی درێژ کردو دەستی گوڵچن خستـە ناو لەپی ، تەزوویکی گەرم بەلـەشی دا داگـەڕا، لەم چرگـەدا هەستێکی ئەفسـوونـاوی دای گرت . . هەستی پێ کـرد، دەستی کچـەو هەمـوو لەشی دەلـەرزێت ، پاشـان لەپـڕ وەکـو پەیکـەرێکی لەبـەرد داتـاشـرابێت ڕەق لەبـەردەمی وەستـا، ئەویش لێی نـزیـك بۆوەو خستی یـە باوەش . . کچە لێوی بەدەمی کورەوە نووساندو وەکو شەنگەبی بەر زریـانێـك دەهـەژایـەوەو بەدەنگێکی نزمـەوە پێی گـوت : ـ سبـەینـێ ، پاش سعـات دە وەرە . ڕۆژەکـە جومعـەیـە ماڵمان چۆل دەبێ . . دایکم وخوشکم بۆ موسل دەچن . . گوێت لێ یە ؟ .

ـ ئا . . . چاوەڕوان بە، هەر دێم .

ـ ٢ـ

پەنجەیەکی لەرزۆکی بەدوگمەی زەنگە کارەباییەکەوە ناو بە شڵەژاوی چاوەڕوانـی کرد . . شەپـۆلـی هەسـت و نەستـی بەجـۆش، لە دیـواری مێـشـکـی دەدا، ئەو لە کاتـە دیـاری کـراوەکـەدا هات ، بەڵام لە قووڵایی دەروونی دا بڕوای نەدەکـرد، کە ئەم کیـژ ۆڵـەیـە وا بەئـاسـانی بە دوای بانگی دڵـداری یـەکـەی بکەوێت و بەبێ ترس و بەم جەسارەتەش لە ماڵـەوەیـان ژوانی بداتێ ! . . لە مێشکی خۆیدا دەیـەویست نیگاری ئەم دیدارە بکێشێت، بیریشی لەوە دەکردەوە، کەچی پێ ویستـە لەم هەڵـوێستـەدا پێی بڵێت . . . چاوێکی بەسـەر کات ژمێـرەکـەدا خشاند ، میلەکەی لەسەر سەعابت دەو نیوی بەیـانی وەستـابـوو . . ڕۆژێکی بەهـەتـاوی گەرم بوو، ئەو کە لەدەرەوەی ماڵـەکـەیـانـەوە وەستـابـوو، جریـوە جریـوی چۆلـەکەکان، کە لەسەر چلەدارەکانی باخچە بچکۆلانەکەیان هەڵ دەبـەزین ، بە چاکی گوێی لێ دەبـوو . بە شڵەژاوی یـەوە هەنـاسـەیـەکی گەرمی بەرەڵـلا کرد . . وەستـانەکەی لەچەند چرگێـك تێ نـەپـەری بەڵام هەستی پێ کـرد ؛ ئەم چەند چرگە وەکـو زەمـانێکی دوورو درێـژ ی بێ پایانە ، هەر لەم کاتەش دا بیـرۆکـەیـەکی ترسناك لە مێشکی دا بروسکەی دایەوە : «باشە ئەگـەر هاتـو دایکـەی و . . شوکـریـەش لە ماڵەوەبوون . . یا لە نیـازەکـەیان پەشیمان ببوونەوە . . من چی بکەم ؟ ! . . چی یان پێ بڵێم ؟ ! » . کە دەرگاکە کرایەوەو گوڵچن بە جوان ترین شێوە هاتە دەر؛ ئەو هێشتا بیری لە وەڵامێکی ڕێك و پێك و ماقووڵ دەکردەوە، کە بیکات بەبیانووی هاتنەکەی . . گوڵچن خەنی ، ئەم خەنینـە گەشایەوەش ، جوانی یەکی دڵرفێنی و ئەفسووناوی خستـە سەر ڕوخسـاری ، کە لەبـەر چاویدا هەر وەکـو مانگی تریـفـەداری تاقی ئاسمـان خۆی پیشـان دەدا . . تۆزیـك لەچـاوەکـانی ڕاما ؛ کەتیشکێکی پڕ سیحری لێ دەردەچوون . بەدەنگێکی نەرم و ناسکەوە گوتی :

ـ ببـوورە ، کەمێك دواکەوتم . . پێش ماوەیەك میوانم هات . . دەفـەرمـوو . . فەرموو لە ژووری میوانان دانیشە . لە دواوەیەوە ڕۆیشت ، پاشـان لەژ وورەکـەی میـوانـان ، کە نزیك دەرگاکە بوو، لەسەر کورسی یەك دانیشت ، گوڵچن بەبزەیێکەوە گوتی :

ـ کەمێـك چاوەڕوان بە ، هەر ئێستـا بەڕێیـان دەکـەم . . دراوسێ مانن و بەس . . من چاوەڕوانی هاتنیان نەبووم !

بەڵام فەرهاد چارەگە سەعاتێك زیاتر چاوەڕوانی کرد . ڕاڕایی و دوودڵێ گرتی و گوشـادی و ترس لە دەروونی دا ئاوێتەی یەکتری دەبوون . لە ڕوودایکی کت وپڕ دەترسا ! .

جگـەرەیـەکی داگیـرسـانـد ، بە قووڵی دووکـەڵـەکـەی هەڵمـژی ، پاشـان لە جێگـاکـەی قیت بۆوەو دەستی بەپیوانی زەمینەی ژوورەکە کردو نگوومی دەریای بیرکردنەوە بوو، بەڵام کچە لەپڕ هاتە ژوورەوەو سینی یەکی بچووکی بەدەستەوە بوو، پیـاڵـە چایـەك و چەنـد لەتە بسکیویتی خستبووە سەر، کە لێی نزیـك بۆوە . تیشکی چاوی ئاراستـە کردو، زەردە خەنـەیەکی گەشاوەو دڵرفێنی ڕووی گەشاندەوە، بە خۆشنوودی یەوە گوتی :

ـ گیـانـەکـەم دوودڵ مەبـە . . ئارامت هەبێ ، هەر ئێستـا دەڕۆن . . پێم گوتن کوری خاڵمە ، هاتووە سەرمان لێ بدات!

فەرهاد هەناسەیەکی ئارامی هەڵکێشا ، کچەش تێ بینی ئەوەی کرد، کەنیشـانـەی پەشێـوان و شڵەژان دەمـوچاوی کوڕە بەر دەدات . بەشەرمەوە گوتی :

ـ دەترسام نەیێ . . !

بەڵام فەرهـاد کپ مایـەوە . . بەس تێ ڕوانینێکی شەیـدایی ئاراستە کرد . پیاڵە چایەکەی هەڵقوراند ، ویستی جگەرەیەکی تر داگیـرسێـنـێ ، بەڵام کچـە دەستـی درێـژ کردو جگـەرەکـەی لـەنێـوان لێوی ڕاپسکاندو پێکەنی : ـ نا . . نا . . زیـانی بۆت هەیـە ئەویش پڕی دایەدەستی کچەو خستی یە ناو لەپی ، ماوەیـەکی دوورودرێـژ لەم دەستـە سپی یـە ڕاما ، کەهەر

...کو پەمو نەرم بوو. پاشان نەپی بەسەر پەنجەکانی دا خشاند، سەرنجێکیشی دایە بازنە زێرەکانی، کە هەردوو دەستەکانی دەرازاندەوە. پاشان دەستەکەی لە دەمی نزیك کردەوەو دایە بەر گوڕی ماچ. کچە هەستی بە دڵخۆشی کرد دەخزێتە گیانی، دڵە زی یەکی بەجۆش لە ناخی دا گڵپە دەکات، تۆزێکی تر لێی نزیك کەوتەوەو پاشان خۆی پێوە نووساندو کچەش بازووەکانی لەملی کوڕە ئاڵاندو لێوەکانیان بە یەکتریەوە نووساند. . لە ماچ و مووچ دا توانەوە. کوڕە گوتی:

- ئەی گوڵچن. . گیانەکەم، چەندم خۆش دەوێی. . من قەت چاوم بە ئافرەتێك نەکەوتووە، جوانی تۆی هەبوو بێت. . !

کچەش: بەزەردە خەنەوە گوتی:

- منیش تۆم هەر لەو ڕۆژەوە چاوم پێت کەوت، خۆشم ویستی. . لە چاوەکانت هەموو شتێکم خوێندەوە. . زانیم تۆش بیر لەچی دەکەیەوە. . ! کچە لەبیری چوو، کە میوانە ژنەکانی نۆ ژوورەکەی بنەبان بەجێ هێشتووە، دڵداری یەکە بە تەواوی مەستی کردبوو، لەم چرگانەدا دونیای لە مێشکی دا سڕابووەوە. . کوڕە زیاتر گوشی یە باوەشی، کچەش خۆی خزاندە کۆشی، بازووەکانیشی لەملی کوڕە هەر وەرئاڵاند بوو. . کوڕە ڕوومەتی بەسینگی کچەوە نوساند، هەناسەیەکی بۆن داری وەکو عەتر پرژایە لووتی. بە هەناسەبڕکێ گوتی: گەرەکمە. دیدەم بە سینە جوانەکەت تێر بکەم. . !

کچە بەبێ سێ و دوو، دوگمەکانی کراسەکەی کردەوەو گوتی: - لەبەر خاتری تۆ، ئامادەم هەموو شتێك بکەم. . گیانەکەم.

سینە نەرمونیانەسپی یەکەی وەکو دەشتێکی سەرتاپا داپۆشراوی بە بەفرێکی بریقەدار بە دەرکەوت، دوو مەمکی خڕوپڕو تورتی، وەکو دوو گومەزی سپی بچووك لەسەریا قیت وەستا بوون. هەر دوو لەپەکانی خستە سەریان و بە نەرمی دەی گوشین. . مەستی هەردووکیانی داگرت و ماوەیەکی درێژ بووژانەوەو کەوتنە خەوێکی ئەفسووناوی. . !

بەڵام لەپڕ دەنگی زەنگە کارەباییەکە هەردووکیانی ڕاچڵەکاند. بە شڵەژاوی کچە لە کۆشی فەرهاد ڕاپەڕی و بەپەلە دوگمەکانی کراسەکەی داخست و خۆی ڕێك وپێك کردەوەو بەرەو دەرگای حەوشەوە چوو پاشان بە پەلە گەڕایەوە، دەموچاویشی: نیشانەی شڵەژانی هێشتا هەر پێوە مابوو، گوتی: - کیژۆڵەکەی دراوسێمان بوو، هاتبوو بانگی دایکی بکا. . دیارە کارێکی بە پەلەیان پێ یە!.

فەرهادیش لەسەر قەنەفەکە هەڵساو بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: - گیانەکەم گوڵچن، وا باشترە منیش بڕۆم! کچە بە سەرسامی یەوە گوتی:

- نابێ بڕۆی. . ئەوان هەر ئێستا دەڕۆن. دووبارە فەرهاد دانیشتەوە، پاش ماوەیەکی کورت، گوێی لە دەنگە دەنگی ژنەکان بوو،ماڵەکە بەجێ دێڵن. گوڵچن دەرگاکەی لە دواویان داخست و گەڕایەوەو لەبەر دەمی دانیشت. . . قسەو، وتووێژ یکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی لە نێوانیان دا بەردەوام بوو. کوڕە گوتی:

- گوڵچین گیان، هەر خۆت دەزانی تاچ ڕادەیەك من تۆم خۆش دەوێ. . من ئەگەر هاتو وەکو دێوانە، هەموو قوژبنێکی ئەم دونیایەم پشکنی یەوە، لەم باوەڕەدام؛ کچێکی شۆخ و شەنگی وەك تۆم بەچنگ ناکەوێ!.

کچە بەڕێی دەی ڕوانی یە گلێنەکانی فەرهاد، بەتاسەوە چاوەدێری وشەکانی کە وەکو دانە مرواری لەنێوان لێوەکانیەوە دەهاتنە دەرێ دەکردو بەخۆشنوودی یەوە گوێی بۆ ئەم قسانەی شل دەکرد.

- فەرهاد گیان منیش تۆم خۆش دەوێ، دڵنیابە بە کەست ناگۆڕمەوە. . ئەگەر لەم هەستەم دڵنیا نەبام، ڕێگای ئەوەم بەخۆم نەدەدا، بە دزی دایکمەوە بتبینم!

- کەواتە قایلی ببی یە هاوسەرم؟

کچە سەری قایل بوونی بۆلەقاند، بەڵام تەمێکی چڕی خەمباری ڕوحساری داگرت و بە عاجزی یەوە گوتی:

- دەترسم شوکریەی خوشکم قایل نەبێ!

- لەبەرچی؟!. فەرهاد ئەمەی بەواق وڕمانەوە گوت.

- بۆ نازانی، ئەویش. . ؟!

فەرهاد بەپەستی هەڵسایەوە سەرپێ و بە تووڕەیی یەو گوتی: - من هیچ بەڵێنێکم پێی نەداوە. . بڕوات هەبێ! کچە بەشەرمەوە گوتی:

- ئەوەت لەبیرنەچێ، کە خوشکی گەورەمە. . ئێستا ئەو لەجیاتی باوکمەو هەر ئەویشە بەخێومان دەکات تۆزێك داما، پاشان بێ ئەوەی سەری بەرز بکاتەوە گوتی:

- دایکیشم لەوانەیە قایل نەبێت، پێش ئەو من شوو بکەم!

فەرهاد دەستێکی خستە سەرشانی و، دیار بوو ئەویش نیشانە خەمێکی کتوپڕ لە دورچاوی لەنگەرەی بەست، بەڵام ویستی کچە دڵنیا بکاو گوتی:

- ئەم خەمە بۆ منی بەجێ بێڵە.

پاشـان بەروویـا خەنی و لەتـەك دەرگـاكەی ژ وورەكەدا وەستاو پرسی : ـ كەی دەگەرێتەوە . . !؟

ـ ئێوارە .

ـ كەواتە ، واباشترە ، بەجێت بێلم با . . .

ـ چۆن حەز دەكەی باوابێ .

فەرهـاد لێی نزیك بۆوەو ماچێكی سۆزناكی لەگۆنای كرد ، هەر وەكـو بیـەوێ ، لەم وەعـدەی لەم دیدارە پێی‌دا دڵنیای بكاو . . ئینجا رۆیشت .

ـ ٣ ـ

لە ژووری مێـوانـان دانیشتبـوو بە پەشـۆكـاوی‌یـەوە لێوەكانی دەكـرۆشت و كەوتبووە گۆمی بیركردنەوە . . دایكی پێش چەند رۆژ یـك قسـەكەی بۆ دایكی گوڵچن دركاندبوو ، لەپیشەكی‌دا وای زانی بـوو ، كە بۆ خوازبینی شوكـریـەی كچـە گەورەكـەی هاتــووە ، بەڵام هەركە راستی یــەكــەی زانی ، واقی ورمــاو دەمــوچــاوی زەرد هەڵ گەرا ، بۆ تاوێكیش زمــانی لاڵ بوو ، پاشان بە توورەبوونەوە گوتی :

ـ من ناتوانم هیچ بەڵێنیكت پێ بدەم ، چونكە قسەكە بە دەست خوشكە گەورەیەتی . . ئەو خاوەنی راستەقینەی ماڵەكەیەو هەر ئەویشە جێگای باوكی گرتۆتەوە .

ژنـەكـەی خوازبینیكەر ، كەویستی چەند قسەیێكی پیاهەڵدان بە كورەكـەی هەڵـرێـژ یت ، دایكی كچە لە جێگاكەی هەڵساو نیشانەی پەستیش بەئاشكرا بە روخساری‌یەوە لكابوو گوتی

ـ چاوەروانی هیـچ مەبن . . من ناتـوانم ئەم داخـوازیـەتان بە شوكریە بڵێم . . !

ئەم گفتـوگـۆیـە ، دایكی بۆی‌گێـرایەوە . . ئەوا ئیمرۆش خۆی هاتـووە داواكـە لە شوكـریـە بكـات ، چونكـە هەمـوو هەوڵ و تەقـەڵـلای دایكی ، پاش چاوپێ كـەوتنـەكـەش ، وەكـو خۆی گوتـی ، هیــچ ئەنـجــامێـكـی نەبـۆوا ! . . . بەڵام من چی پێ بـڵێـم . . . چۆن لەگــەڵـی بدوێم ؟! . ئەم بیــروكــانــە لەئـەنـدیشەی‌دا جوولەیان دەكرد . ئۆفێكی هەڵ كێشا ، تاوگێر دیـار بوو . . لەجێگاكەی قیت بۆوە ، دەستی بەپێوانی زەمینەی ژ وورەكـە كرد . دواكـەوتنـەكـەی شوكـریە زیاتری شڵەژاند .

پەردەی پەنجـەرەكـەی سەر باخچـەكەی خانووەكەیانی لادا ، چاوەروانی كچەی دەكرد : گوڵچنی دیت لە باخچەكە بەرەنگ هەڵ بزركـاوی‌و پەشۆكاوی‌یەوە راوەستاوە ، ئاگای لەوە نەبوو ، كەفـەرهـاد لەپـەنجـەرەكـەوە سەیـری دەكا . پاشان گوڵچن‌هۆ ژ وورەكەی بنەبان هەڵ كشا ، فەرهاد گوێی لەدەنگی بوو

دەی‌گوت :

ـ خوشكێ بۆ دواكەوتی ، نیو سعات زیاتر فەرهاد چاوەڕوانت دەكا ! .

كورە دووبـارە لەسـەر قەنـەفـەكـە دانیشتـەوە ، جگـەرەیـەكی هەڵ گیـرسـاندو بەدوو پەنجەی لەرزۆكەوە خستی‌یە نێوان دوو لێــوی ، بیــری لەچــەنــد وشـەیـەك دەكـردەوە ، بەڵكـو لەم هەڵـوێستـەدا بەهانایەوە بێ . بەڵام هێندەی پێ نەچوو شوكریە هاتـە ژ وورەوە بەجوان ترین شێوە خۆی رازاندبۆوە ! . . پرچی زۆر بەجـوانی رێك وپێك كردبوو ، كراسێكی نوێی ونەوشەیی كردبووە بەر . ماكیاجێكی تۆخی لە دەموچاودابوو ، ویستبووی وردەچـالی روومـەتی پێ پربكاتەوە . فەرهاد لەبەری هەڵساو خۆشنـوودی وكـامـەرانی لە روخســاری كچـە دەپـەنگـایـەوەو زەردەخـەنـەیـەكی دڵ كەرەوەش لەسـەر دوو لێـوی لەنگەرەی بەست ، دەستی بۆ تەوقە كردن درێژ كردو گوتی :

ـ بەخێـر هاتی گیـانەكەم . . من لەوە دڵنیا بووم كە رۆژ یك دێ ئەم هەنگاوە باوێیت . . !

پاشـان لەتـەكیـەوە دانیشت و دایـە قاقـای پێكـەنینێكی بەرزو بانگی گوڵچنی خوشكی كرد ، كەهات لێی پرسی :

ـ هیچت بۆ فەرهاد نەهێناوە!

بە قورگە گیرانەوە گوڵچن وەڵامی دایەوە :

ـ هێشتا هیچم بۆی نەهێناوە .

ـ كەواتـە زووكـە شتێـك بێنـە . . قاوە . . چایی ، هەر شتێـك بێت . . هە . . با شەربـەتی پرتـەقـاڵ بێ . . پێكەنی . . ئەمە باشتر نی‌یە . . ؟ .

گوڵچن بەواق ورمـانەوە سەرنجێكی دایێ . ئەو دەی‌زانی كەوا خوشكــەكـەی لەبن بەردی كەر نوستـووە ، دەشی‌زانی دایكی نەوێـراوە راستی یـەكـەی پێ بڵێت! . . هەنـاسـەیـەكی قووڵی هەڵ كێشـا ، لەدڵی خۆی‌دا گوتی : «خوشكە كڵۆلەكەم بەخوا تۆ هێشتـا لەخـەیاڵ دا دەژ ی . . نازانم چی‌بكەم . . خۆ ئەگەر خۆشـەویستی بكــرایــە بەیــادگـار بدرێت ، من بەهـەمـوو رەزامــەنـدیكمـەوە پێشكـەشم دەكـردی . . بەڵام ! . لێـرەدا ئاهێكی هەڵ كێشا ، خوشكەكەشی بەسەری‌دا قیژاندی :

ـ ئەوا بۆوەكـو بزمـار لەشـوێنـەكـەت چەقیوی . . چی‌یە دیارە دڵ گوشاد نیت ! .

گوڵـچـن بەكـپـی سەیــرێكی كــردو ، كەرۆیشتیش خەمێكی گەورەی لەنــاخــی دەروونــی‌دا دەشــاردەوە . شوكــریــە

لەکەیف خۆشیا لەقسەکردن رانەوەستا. وشەی وای لەدەم دەهاتە دەر کەهیچ پەیوەندی یان بەیەکەوە نەبوو، نەی دەزانی چۆن ئەم خۆشنوودی یەی دڵی دەربڕێت!.. گیانەکەم ئەوا بۆ واکری.. چی یە من هیچ نیشانەیەکی گوشادی بەرووتەوە نابینم!.. هە، لەبەرچی؟!. فەرهاد کپ دامابوو، جار جارەش بەدۆش داماوی یەوە سەیری شوکریەی دەکرد، پەشێوان و شڵەژان، بەتەواوی زمانی لاڵ کردبوو!..

گیانەکەم دەشتێك بڵێ.. ئەوەی لەدڵتە دەری ببڕە، هەرچەندە من دەزانم نیازت چی یە بیڵێی!.. خۆمن ئەوە دەزانم تۆمنت خۆش دەوێ.. ئەممم هەر لەوڕۆژەوە زانی، کە دەرزی یەکەم لەرانت چەقاند، دایکت تۆزێك غیرەت گرتبووی، لەوە تەنگاو بوو نەوەك جێگاکەی ئەو بگرمەوە.. هە دێتەوە یادت کە نەخۆش بووی؟!.

من دەم زانی ئەم ڕۆژە هەر دادێ.. هە، هەرسووری لەسەر بێ دەنگی یەکەت؟!.

گوڵچن لەم تاوەدا، لەبەر دەرگای ژوورەکە وەستابوو، سینی یەکی بەدەستەوە بوو، دووپەرداخ شەربەتی پرتەقاڵی لەسەربوو، قسەکانی خوشکەکەی بەتەواوی بیست. کە هاتە پێشەوە جەستەی وەکو شەنگەبی یەکی بەر زریانێك دەهەژایەوە. تاریکایی بەرچاوی گرت و لە تەپلە بچووکەکەی بەردەمیان ئەنگوت دەماودەم کەوتە خوارەوە. پارچەوپروچی پەرداخەکەش لەسەر زەمینەی ژوورەکەدا پەرش و بڵاوبوونەوە. پروشکی شەربەتی پرتەقاڵەکەش، دەموچاووجل وبەرگی فەرهادو کراسە ونەوشی یەکەی شوکریەشی تەڕکرد!. فەرهاد بە پەلە هەڵسایە سەرپێ و پری دایە بازووی گوڵچن و بەرزی کردەوە. بەڵام گوڵچن بەکپی دەگریا... ئەوە دەگری.. لە بەرچی؟!. شوکریە ئەم پرسیارەی کردو یەکسەر هەموو تیشکە پرشنگدارەکەی خۆشنوودی، لەسەر دەموچاوی دا کوژایەوە. ماوەیەك لە خوشکەکەی ڕاما!، بە توورەبوونەوە بە سەریا قیژاندی:

ـ هیچ کاتێك چارەت نیشانەی خێری بۆمن پێوە نەبووە!.. دەلەبەر چاوم لاکەوە، هەی نێوچەوان ڕەش.

ئەم قسانەی خوشکی، گوڵچنی سمی و دڵ گیری کرد، بۆیە هەر وەکو شێرەمی کێڤ بووەو بە ڕووی تەقی یەوە گوتی:

ـ من نێوچەوان ڕەشم، یا تۆ لەخەیاڵ و زرەخەون دا دەژیی.. تۆ وااهاتووی کۆشك و تەلار لەسەر لم درووست بکەی. من چی بکەم.. ڕاستی یەکە ئەوە نی یە...؟!.

ـ مەبەست لەم قسانە چی یە؟!.

شوکریە ئەم پرسیارەی لە گوڵچن کردوو بەواق ورماوی سەرنجێکی دایە فەرهاد! بەڵام فەرهاد کپ مایەوە، شوکریەش پری دایە بازووی و بە توندی هەژاندیەوە:

ـ پێم بڵێ، مەبەستی لەم قسانەی چی یە؟!

گوڵچن دوو هەنگاو کشایەوە پاشەوەو لەتەك دەرگاکەی ژوورەکەوە وەستاو بەسەر فەرهادا قیژاندی:

ـ بۆ ڕاستی یەکەی پێ ناڵێی.. بۆ کێشەکەی بۆ ڕوون ناکەیەوە، بۆ لێ دەگەڕێی بە خەیاڵ بژ ییت؟!.

خەیاڵ.. چ خەیاڵێك●!

شوکریە ئەمەی بەواق ورمانەوە گوت و پەردەیەکی زەردی چریش دەموچاوی داپۆشت و بە شڵەژانەوە دەی ڕوانی یە فەرهاد..! فەرهاد بە زمان گیرانەوە گوتی:

ـ ئاخر تۆ دەرفەتی ئەوەت نەدام ڕاستی یەکەت پێ بڵێم!.. من پێش ئێستاش ویستم خوازبێنی گوڵچنت لێ بکەم بەڵام نەم دەویست بت خەمە بەر هەڵوێستێکی وا دڵت پێی برەنجێ.. پاشان دابوایە دایکت ئەم کێشەیەی بۆت ڕوون بکردبایەوە!

شوکریە لەسەر قەنەفەکە قیت بۆوە، تاوگیری شلەژان هارو هاجی کردبوو، چریکاندی:

ـ کەواتە ئەویش ئەمەی دەزانی؟!.. ئای لەم کارەساتە.. ئای لەم بەدبەختی یە.. ئای لەم بەختەڕەشەم.. هەر تۆ مابوویت قوڕ بەسەرم بکەی..!

ئیتر شێتانە کەوتە شین و فیغان بە چەپەڵۆك ڕوومەتی دادەپلۆساندو بە هەردوو چلکیشی قژی دەڕنی یەوە، هەر وەکو ژنێکی کۆس کەوتوو لەناوەندی ژوورەکە هەڵ دەپەڕی.. دایکە غاری دایە ژوورەکە، ئامێزی لە کچەکەی وەرئاڵاند، ویستی هێوری بکاتەوە.. بەڵام کچە وەکو شێت لە ژوورەکە سەمای دەکردو دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە: خوایە قەبوولی نەکەی.. خوایە قەبوولی نەکەی.. پاشان هێرشی بردە سەر فەرهادو بە سەریا قیژاندی: برۆ.. لە بەرچاوم مەمێنە.. لەبەرچاوم مەمێنە.. لە.. بەر.. چاو.. وو..

ئیتر یەکسەر بەربۆوەو دڵی لە خۆچوو، فەرهادیش بە تۆقاوی لە جێگای هەڵساو بە پەلەماڵەکەیانی بەجێ هێشت گوڵچنیش بە دواوەی ڕای کردو لەبەر دەرگای حەوشە وەستاو، بەتی ڕوانینێکی پڕئێش و کەسەرێکی کوشندە.. تا لەبەرچاوی برز بوو، هەر سەیری دەکر..!

چیرۆك

# ڕەشۆ ئاغا!!

چیرۆکی: فاتح مدرس

وەرگێڕانی: مستەفا سالح کەریم



ڕێگەی نێوان گوندی حاجی خێل و ڕاجۆ هەورازو هەڵدێرو سەخت بوو. ڕەشۆ بە دوای کەروبەرەکەیەوە پەکی کەوتبوو. نۆبەنۆیش بە ناچاری لە کەرەکەیەوە دەژان. بەڵام پیرە ڕێگا تا دەهات سەختتر دەبوو. وای دەهاتە پێش چاوان کە گوێدرێژەکەی هەرچەند هەنگاوی بەرەوپێش دەنێ، چیای [کەموش] زیاتر هەڵدەتۆسێ. بە نۆرە هەرجارەی یەکێکیان سەریان بلند دەکردەوە تا بزانن داربەڕووەکە دەرکەوت یان هێشتا هەر دوورە؟ خۆ نەگە، دابێ مانی ئەوەیە تا پێش خۆرئاوا نەگەنەوە [زرجو].

ڕەشۆ ئەوە حەنی بوو کە هەت بچێتە ساڵەوە، پشتی زیاتر دەچەمێتەوە. پێچ‌وپێچی ئەم ڕێگایەش لە بەردەمیا دڕندەتر دەنوێنی. زەوییەکە لێرەدا تا دوێنێ بوو تەخت بوو کەچی ئێستا وای دەچێ قوڕی تێ کرابێ. ئەولاتریشەوە لێژ دەبێتەوە. جار نێش لە بەری دەست نەرمتر بوو. لەبەر خۆیەوە کەوتە ورتە ورت. کردەوە گلاوەکانی ئەبو عومەری وەبیر دەهاتەوە کە ئەم ڕەنج دەداو ئەو نووشی دەدا.

بەڵام ئەوەی بە زاری دەهات بە شێوەیی بوو لە توانای کەرەکەی دا نەبوو تێی بگا. کە وێنەی ئەبو عومەر بە تەواوی لە بەرچاوی بەرجەستە بوو، تفێکی کردە سەر زەوییەکە «چەند نەرەقە! بەزەیی مەت لە دڵیا نییە! وەك ئەو کێوە فیلەتەنە ڕەق وبێ دەنە!» بۆ ساتێ وازی لە بیر کردنەوە هێنا تا هەناسەیی

بدات، درەختـە گەورەش لە نێـوان تاشەبەردە ڕەشەکانەوە، لە سەر شانی چیـاکـەوە بە دیـار کەوت. هەنـاسـە برکێی پێ کەوتبوو، لەبەر خۆیەوە بانگی یەکێکی نادیاری دەکرد:

ـ نازە، کچە شیرینەکەم! ئاهـ نازە گیان.

بە نووکی داردەستـەکـەی لە پشتی کەرەکـەیـەوە ژەنـد، ئەویش بە دەم ئەم تێژەنینەوە هات و بەرەو سێبەرەکە ملی نا. نیوەڕۆیی بوو، زەوی داخ بوو بوو، لە قرچەی گەرمادا گەیشتنە بەر سێبەرەکە، چەرچی یەکە بە کەرەکەی وت:

«چ دەبوو ئەگەر لێرەکانە بمردینایە؟».

هەنـاسـەیێکی قوولی هەلکێشـاو ئەم جارەش ڕووی کردەوە کەرەکەی و پێی وت: «من لا ڕێم لەوە نی یە کە لە تەنیشت تۆوە بنێژ ڕێم، لەعنەتی خوا دایك و باوکمان!».

چیا گرۆی کە لەوە دەچوو بە سەر تاوێرە بەردەکان دا بنەڕێنێ، گونـدەکـان دەتـوت توانـەتـەوە «نـە قاسپەی کەوێ! نە نەڕەی کەمتیـارێ! ئای کە تەمـەن لە سەر ئەم خاکـە بێ فەرە چۆن بە فیڕۆ دەڕوات!».

پالـی بە قەدی درەختـەکـەوەدا و دەستـێکی بە قاچـە هەلتلوقـاوی یەکانیا هێنا. شیوە قوولەکەی بەری ڕۆژئاوا لە بەر خۆردا چەنـد تالێکی دووری دەخستـە ڕوو، مامـەی دێـوەرە کەوتە نێو چەند دیمەنێکی گران و نالەبارەوە، گوێدرێژەکەشی سمکـوڵی دەکـرد، وەك بیـەوێ ناقـابیلی خۆی بەرامبـەر بە مامـەڵـەی خاوەنەکەی لە تەکیا دەر ببڕێ، بە تایبەتی کە هێشتا کەلو پەلو بار هەر بە کۆلیەوەیە. ڕەشۆ هەستایە سەر پێ ویستی پێلاوەکانی لە پێ بکات، بەلام نەیتوانی، چونکە قاچ و قولی بووبـوونـە بلۆق. پێـلاوەکانی هەلدایە سەر پشتی کەرەکەو لە سەر توورەکـە گەنمـەکـان جێگیـر بوون، بە هێـواشی کەوتـە ڕاکێشانی ڕەشمەی گوێدرێژەکەی بەو ڕێگا سەختە ناهەموارەدا.

خۆر بەرەو چیـای [قـروداغ] لار دەبـووەوە، شیوە قوولەکە بە ئۆقیانووسێکی جوانی دلگیر لە تیشکی شینی پێك دا شکاوی بێ سەرو بن، داپـۆشـرابـوو، لە قوولایی شیوەڕەش دا ڕوبارە زێـرینـەی [قـەرەسـوو] وەك تولـە مار دەکشا، گرم و هووری شەمـەنـدەفـەری ئەستەمـوولیش ڕوو لە زیـاد بوون بوو. کە گەیشتنـە سنگی شیـوەکـە ترپەی دلی [ڕەشۆ] هاتەوەسەر خۆ. چیـای [کمـوش] بەرەو باکـوور هەلدەزنا.. باکووری دوور. ڕەشۆ بە گوێدرێژەکەی وت:

ـ نارەسـەن چ دەبـوو ئەگـەر خۆمان بهاویشتبایە سەر پشتی ئەو دێـوەو بیگـەیـەنـاینـایـە باکـوور، دەلێن لەوێ، لەودیـوولاتی تورکـانـەوە زەوی وزارێکی زۆر بە پیت و بەرەکـەت هەیـەو خەلکـەکـەشی چاك و دلپـاکن.. ئاخ بریـا بیان گەیاندمایەتە ئەوێ! دەستـێکـی بە شوێـن برینـێکـی کۆنی سەر سمتی کەرەکـەیدا هێنـا، هێمنی و بێ دەنگیش بەرە بەرە لە نێـودار بەڕووەکـان دا بالی ڕا دەکێشت بلنـدە شوومـەکـانیش بە سەر تاوێـرە بەردەکـانی ئەم لاو ئەولای ڕێگـکـەوە نیشتنـەوە. بەو شێـوەیە دیمەنێکی سامناك لە دەروونی ڕەشۆدا نەخش، چرپە چرپی گومـانـویش لە درەختـەکـانـەوە دەبیستـران، کەواتە با فاتیحـایێـك بخـوێنێ هەرچەنـدە بە باشیش نایزانێ. بە هەر حال فاتیحـای خوێنـد بەلام کۆتایی یەکەی بەم شێوەیە هێنا «یا ربیّ العالمون... ئامین».

گوێدرێژیش کەوتە ڕێ.

●●●

کە خۆرئـاوا دەبێ گونـدەکان گەورە بن یان گچکە دەمرن، ئەو سوورایی یـەی هەمـوو ئێـوارانێ سەر نێـوی ئاسـۆ ڕەنـگە دەکـات، لەم چوڵـەوانی یە دا کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاسایشی بە خۆیەوە نەبینیوە ترس دەخاتە نێو چاوی جوتیارەکانەوە.

گونـدی [ڕاجـۆ] ش حالی وا بوو. پێلوەکـانی نیشتن. کە ڕەشـۆ گەیشتـە بەرەوە ئەو لە خرپـەی خەودا بوو، وی هەست کرد کە شەوچنگی لە عەقلی گیـر کردووەو دەیـەوێ بەرەو دلی خۆی بکوتێ. لەو کاتەدا وای بۆ چوو کە دەبێ لە بنەڕەت لە تەك ئەم گوێدرێـژەدا پێکـەوە هاتبنە سەر ئەم زەوی یەو زنجیرێکی ئەستـووریش بە چیـایـەکیـەوە بەستـوتەوە، ئەوچیـەش [ئەبو عومەر]ە. برسێتی زۆری بۆ هێنا لە دلی خۆی دا وتی: «ئەبێ بەرامبەر بەم مشتە چل و چیوە ڕزیوە چی بکەن؟ من ـ ئێستـ ـ وەك مستەفای هاوڕێم دەلێ: بوومەتە گردۆنکەیێکی خوێن»

ویستی لە پێشـا سەرێـە کاولـەکەی خۆی بدات و پەڕرووی نان بخوات، بەلام دوا جار وای بە چاك زانی کە بەر لە هەموو شتێ ئەم خەلەو دانەوێلەیە بۆ ئەبو عومەر ببات.

بە نێـو بازارە چۆلـەکـەدا ڕۆیشت. جگـە لە چەند سەگێك نەبێ هیچی بەدی نەکرد، ئەوانیش لە سەر پاشوو چیچکەیان کردبـوو، نوورە لووری ناسـازیـان ئەو ناوەی پڕ کردبـوو، وەك بیـانـەوێ داوای چاوپۆشی بۆ بکوژ و بڕەکان بکەن ئاوا بوون. بە نێـو کۆلانـە تەپـوتـۆزاوی یـەکـان دا ڕۆیشت تا گەیشتـە بەر

دەروازەییکی بە شین بۆیە کراوی چاوەزار پیا هەڵواسراو. ئەمە لە خۆیدا نیشــانــە بوو کە ئەبــو عومــەر دەوڵــەمــەنــدو دەست ڕۆیشتــووە، دەشڵێن خۆی هەڵخــرانــدووە کە ئەم ساڵ بچێتە زیــارەتی ماڵی خوا. ڕەشــۆ لەم بیر کردنەوەیەی دا سەری با داو چاوی بڕی یــە دەســتــە قلیــشــاوی یــەکــەی، تۆبەو ئەستەخفاری لە خوا کردو دەستی بۆ ئەڵقەرێزە مسینە کە برد.

- کیم در؟ مینو هادە؟

ئەو دەنگــەی لەو دیــو دەرگاکەوە هات لە بار دڵ خۆش نەبوو «دەنگی ئەو ئافــرەتــە دەمەوەرەیە کە بۆتە کابانی ماڵی حەڵەبی و پەیتــا پەیتــاش هانی دەدا کە نازەم لێ زەوت بکــات... لە هەمووش سەیرتر بە خۆی دەڵێ [حاجی] یە.. هەرچەندە من زۆر باش دەزانم کە...».

دەرگــەی حەوشــە کرایــەوە، پیــرە ناوری دایــەوە چاوی بە ڕوخســـارێکی وا کەوت کە بۆ پێشــوازیی میــوانی وا درەنــگ وەخت بشێ، ڕەشــۆ سەری دانــەواند وبە بلمە بلم بە تورکی وتی: [أبو عمرە چاغیر] واتە «ئەبو عومەرم بۆ گاز بکە».

شیــرەی حاجــی یــە پەردەی بێ دەنــگــی شەوی دڕی، سەرێکی خڕ لە تاقێکی سەر دەرگایەکەوەکە بە ئینجانەی ڕەشبە ڕێحــانــە تەنــرا بوو بە دیــار کەوت، دەم و چاوێکی قەڵــەوکە شوێنەوارەکەی بە جووتێ سمێڵی تورکی و دوو ڕوومەتی گونکە هەوێــرێی تەســك بوو بووەوە. ڕەشــۆ خۆی دابــوو بە سەر دار دەستــەکــەی داو لە دەنگی کابــرای کەڵلە قەوی سەری بڵنــد کردەوە، گوێی لێ بوو کە بانگی کرد:

- هە ڕەشۆ! بۆ دوا کەوتی؟ فرۆختنت چۆن بوو؟

ئەمجا سەرە خڕەکە بزر بوو، دەنگی قاپقاپ دەهات کە بە پلیکــانــەکــان دا دەهــاتــە خوارێ. دڵی دیــوەرەی بەسزمان لە ترســـــــــا کەوتــە هەڵــەکــە سەمە. دەرگــا کرایــەوەو لەشێکی بەرگیر نەی لێوە دەرکەوت و وتی:

- چەندت هێناوەتەوە؟ دەسکەوتت چەند ڕبە دەبێ؟

ڕەشۆی ماندوو شەکەت لە وەڵام وتی:

- جانم! هەرچی و ئەســــەر ڕشتی ئەم کەرە بەســـزمــانــە هی حەیتانە. ئیتر پیویست بە [سوعاڵ] ناکات!

ئەبــەر ئەوەی خــوەن کــرو چەوسێنــەرەکان لە هەر سوێنیکی ئەم جیهــانــە بێ بەیەك شێوە دەدەوێن، بەوپێیە ئەبو عومەری سوخۆری ــەوەن دەسەڵاتیش بە خەمان شێوەی وشك و ڕەق و

بە چاوی بە گومانەوە وتی:

- ڕەشۆ! گوێ بگرە! دەبێ ئەو قەرزەی کە لە لاتە بیبژ ێریتەوە، پێش ئەوەی مانگی کانــوون بێت، خۆت دەزانی وا زستــانمان لە پێشــــە. ڕەشــۆ چاك لەوە حاڵــیــی بوو کە ئەم حەرام خۆرە دەیەویست بڵێ «قەرزەکەم بدەرەوە پێش ئەوەی بمریت».

توورەکــەکانی دەرهێناو یەك بە دوای یەك دا، دایەدەستی. ئەویش بە چاو مەزەنــدەی دەکردن، وەك بیان قەبڵێنێ، ئەمجا دەستی پێ دا دەهێنان و پاشان هەڵی دەدانە نێو حەوشەکە.

- ڕەشــۆ! تۆ پیــر بوویت، خێرت نەماوە.. ئەها بزانە بارەکەت چەند سووکەڵە بوو!

کە ڕەشــۆ ویستی زاری بکــاتەوە، ئەبوعومەر چاوی بە دەسکێ پیــازی ڕزیــو کەوت لە بنــی یەکــێ لە دوو سنــدووقــە تەختەیی یەکەدا مابووەوە، نەڕاندی:

- ئەمــە چی یــە؟ ماڵی قەڵبی گەڕاوە! چۆن نەتفــرۆشتــووە؟

چەرچی یە پیرە بە هێمنی و لە سەرە خۆ وتی:

- سەگە بێزی نایەت بیخوا!

- دیــارە تۆ لە من شارەزاتــری، کەواتــە باشــە.. وا لە سەر حسابەکەی تۆی دەنووسم!

بە تەوسێکەوە قسەکانی تەواو کرد:

- گوێ بگــرەڕەشــۆ! تۆ پیــرێکی خەڵــەفــاوی پەك کەوتەی، بە کەڵکی هیچ کارێك نایەیت.

پاشان ئەمووستی بۆ دەسکە پیازەکە ڕاکێشاو وتی:

- ئەبــێ تۆ بیخــۆی.. هەرچۆنــی بێ لە سەر حســـابی تۆ نووسراوە.. وا نی یە؟

پیــرە سەری دانــەوانــدو بە زەردەخــەنــەیێکی بێ دەســەڵاتــانە زەوی یــەکــەی سڕی؛ ئەبو عومەریش لەو دیو دەرگاکەوە لە چاو ون بوو.

«۳۰ ساڵە ڕەنج بۆ ئەم ملە قەوی یە دەدەم، کردەی من و بردەی ئەوە، کاتی خۆی ۲۰۰ لیــرەی سووریــاییم لێ قەرز کرد، ئیتر ئەو قەرزە بوو بە تەوقی ئەسارەت چووە گەردنمەوە، هەر چەند شتێ لەو قەرزە دەبــژێــرمــەوە، بۆ سبــەینێ دوو ئەوەنــدە دێتــە جێ.. ڕۆژ تا ئێــوارە ڕەنجی فەرهــادی بۆ دەدەم و چەرچێتی دەکـــەم و دەیکـــەم بە گەرووی دا پیــرە قەرزیش هەر لە جێی خۆیــایــەتی؛ دارەکەی بە دەستــەوە گرت و بە هێواشی ڕەشمەی گوێ درێــژەکــەی بە دوای خۆی دا ڕاکێشا، دەسکە پیازەکەش لە بن هەنگڵیا بوو.

جووتـه هاورێ لە تاریکـایی شەو دالـە بەردەم کوختـەیێك دا ڕاوەستـان، کوختـەکە هەمووی چەند بستێ لە زەوییەکە جیا بوبـووەوە. یەکێکیـان وەرچـەرخـاو کورتانەکەی لەوەکەی تریان کردەوە، زامـەکـانی سەرپشتی دەمیـان کردبووەوە، هاورێکەی هەندێ گڵی پاکی دیوارەکەی پێوە کردو دەستێکی بە دەرگاکەوە ناو چووە ژوورەوە. نازەی تاقـانـە کیـژی لە نێـو شەپـۆلی تاریکایی دا خەوی لێ کەوتبوو.

ـ نازە، نازە قیزا من ڕا بە.

ـ تە هاتی بابۆ؟

خاوەن دەنـگ هەستـا، دەتوت لاسکی گوڵە گەنمە، هێندەی پێ نەچـوو تاریکـایی بە داردەستێکی ئەفسـووناوی کردی بە کیژێکی شۆخی وا کە نە هەژاری و نە شەو لە توانایان دا نەبوو جوانی یەکەی بشارنەوە.

چراکـەی داگیـرسـانـد، کاسەیێ دۆی بۆبابۆی هێنا، خۆشی بەرامبـەری دانیشت و بە لەپی دەستی زەوییەکەی دەسڕی. ورتـە ورتێ لە نێـوانیانا هات، ئەوسکاڵایە ئەوەی دەگەیاند کە مامـەی دێـوەرە گشت شەوانێ نیـوە مردوو دەبێ و بۆبەیـانی بە ناچاری ڕاست دەبێتەوە. کیژەکەشی ئەم شەو بێ شێو سەری ناوەتـەوەو هیـچ نەبـوە بیخـوات. نەوتیشیـان نەمـاوە، کابرای سووخۆریش ئێوارە نەوتی نەداونێ وتوویە: قەرزەکانی باوکت کەڵەکە بوون.

ـ بابـۆ ئەز دێمـە مردن ئەگـەر خۆبۆوی بەرازەی شل بکـەی. دبێژ ن نیازی وەهایە بمفرۆشی بە جمعە ئاغا.

بابـۆ تە چۆن لەم هەمـی سالانـە نەتـتـوانی قەرزی وی بدەیتەوە؟ ئێ.. با شیکایەت بکات، کابرایێکی فاییزچی یە، حکومەت گوێ لە قسـەی وی ناگرێ.. گوێ لە قسەی ئەنگۆ دەگرێ!!

پیرەمێرد وەك تەختە لێی درێژ بوو، چراکەش تەرایی نەوتی تێ دا نەمـاو کوژایـەوە، وەك پێکـەوە لە ئیمـان دا بووبن. بەم جۆرە کۆیلەکانی ئەبو عومەر خەو دەیان باتەوە.

بەیانی ئەبو عومەر بەرە شۆی کرێگرتەی وت:

ـ خوا خێـرو بەرەکـەتـی نارد. جمعـە ئاغـا قایـل بوو کە قەرزەکەت بۆ ببژێرێتەوە.. بە ڕاستی پیاوە!

ڕەشۆ لە توانای دا نەبوو لەوە تێ بگات چۆن خۆر لەم جۆرە کەسانە هەڵدێ؟ ئەی خوا خۆی وا ناکات خۆر هەڵبێ؟

سووخۆر چەرچیەکەی گاز کردو پێی وت:

ـ ئەمـە بەشی ئەوڕۆتـە، بیبـە بۆ گونـدی [دەروێش ئاوە سپی] ئەبـو عومـەر ملە ئەستوورەکەی هەڵکراندو چاوەکانی برینە ئەم پیـاوە کوردە بێ دەسـەڵاتـە چەوساوەیە کە وەك ژ یێژك هاتبووەوە یەك و دەتـوت پارچـە کاغـەزەو دەسووتێ، هەرچۆنێ بوو هاتە زمان و وتی:

ـ ئاغـا.. لە توانـام دا نی یـە چیـای [مووسا کۆی] ببڕم، زۆر سەختە، کەرەکەیشم زامدارە.

ئاغـا ناوچـەوانی گرژ کرد، بە شێـوەیێ نێـوانی چاوە داڵـە کەر خۆرەیی کـانی هێنـایـەوە یەك کە غەزەبی لێ دەبـاری، ئەمجا پسـووڵـەی حسابی کەلوپەلەکەی بۆ فڕی دا کە پێویستە ئەمڕۆ ئاڵ و گۆڕیانی بکات، سابوون، کلافە دەزوو، نوقڵی منالان، قومـاشـی هەرزان بەهـا بۆ جوتیـارەکـان، قاپ و چینی و فەخفووری هەمە چەشن.

ئیتر پشتی تێ کردو ڕۆیشت.

ڕەشۆ سەیری پشت ملی کابرای خوێن مژی کرد، توێی غەزو بەز دەر کەوتن، دەتـوت گوریسێکی ئەستووری پیس توند ئەم ملەی جەڕاندووە.

ڕەشـۆ ئەم وێنـەیـەی لە پەسنـد بوو، بۆیـە لە دڵی خۆی دا وتی:

«ڕۆژ ی دێت ئەم ملانـە بکـرێن بە پەتی سێـدارەوەو گونـدی ڕاجۆش بحەوێتەوە».

هەردوو دەستی ڕووەو قیبلە هەڵبـڕی، چاوەکـانیشی برینـە ئاسمـان و پرسیـارە کۆنـە سواووە هەمیشـەیی یـەکـەی لێ کرد «خوایە! تا کەی؟».

ئەمجـا پریـاسکـەو کەلـوپەلەکانی هەڵگرت و بەرەو ڕۆژئاوا بە ڕێگای شیوی [سەراسین] دا کەوتە ڕێ.

گەرمـا زۆری بۆ گوێدرێـژەکـەی هێنـا. کۆمـەڵێ لە خەڵکی ئاوایـی [کـورانـلی] کە بەرەو بازاڕی [ڕاجـۆ] دەهـاتن پێی گەیشتن، ئەمە وای لە ڕەشۆ کرد کە هۆشی بێتەوە بەر و لە خۆی بپرسێ «ئیمـڕۆ نۆرە بازاڕی ڕاجـۆیـە» خەڵکەکە گاڵتەیان بەم دێوەرەوەیە دەهات کە چۆن بازار بەجێ دەهێڵێ و بەرەو خۆرئاوا ملی ڕێگای گرتۆتە بەر لە کاتێك دا خەڵکەکە لەوێوە ڕووەو خۆر ـ هەڵات دێن.

زانی کە ئەم ماستـە موویێکی تێ دایـە، ئەبێ ئەبـو عومـەر دەستی لەم کارەدا بێ. دڵی بۆ نازەی تاقانەی کەوتە ترپە ترپ،

وێنەی دەم و چاوێکی دزێو هاتە پێش چاوی، دەم و چاوی [جمعە ئاغا]. گوێدرێژ دەڕۆیشت و ڕەشۆش بە دوای دا.

کە گەیشتە گوندی [مووسا کۆیو گوندەی خەڵکەکەی بۆ ڕق هەستاندنی ژەندرمەکان پێیان دەوت [مۆسکۆیی] دەمە دەمی نیوەڕۆ بوو، سێبەر گاڵی گواستبوەوە. لەم گوندەدا کەسێ نەبوو شتێ لەم چەرچی یە خەڵەفاوە بکڕێ کە بەم هەموو ئەزێتە دەیەوێ ڕێی ڕۆژئاوا بگرێتە بەرو خەڵکیش بەرەو بازاڕی خۆرهەڵات دەڕۆن. پوورە [دندە] جامولکەیێ دۆی دایێ، پاش ئەوەی خواردی یەوە دەستەیێ دەرزی درومانی دایێ. منداڵێك پارچەیێ نانی بۆ فڕێ دا، بەڵام پیرەی داماو نەیویست.

بەنێو تاوێرە بەردەکان دا کەرەکەی پێش خۆی دا لە نشێوی یەوە بۆ هەوراز، هەتا گەیشتە شیوەگاور، لەو کاتەدا باڵندەیێکی زەردی گەورە بە ئاسمان دا دەفڕی، پیرەمێردەکە وتی: «باش سەیرم بکە، بەخوا مریشکم پێ نی یە!» باڵندە گەورەکە بڕوای پێ کردو لە پشت چەند تاشە بەردێکی گەورەوە لە چاو ون بوو... ڕێگاکە سەر لە نوێ بەرز دەبوەوە، وەك شوورەی قەڵای بەندیخانەیێ کە لە نێو جەنگەڵی دارو درەختا نوقم بووبێ: کە گەیشتە سەر چیاکە دەشتی [عەفرین] لە پێش چاویدا دیار بوو، شنەی بای شیوی [کینخ] هەڵی کرد، گوندی [دەروێش ئاوە سپی] ش تیر هاوێژێ لێوەی دوور بوو. کە لە نێو ڕەزو باخی هەنجیرو درەختی چوالەدا خۆی حەشار دابوو. دەنگی دەهۆڵێکیش لە دوور دەهات.

کە بە لای سەرەنوێلکی گوندەکەدا تێپەڕی کچان چمکی کراسەکانیان بە ددان گرتبوو، پێشی دەکەوتن و هەندێ جاریش دوای دەکەوتن، بە دوو ئافرەت گەیشت بە چرپە بە یەکیان وت: «دەشێ ئەو بێ!» ئەم واتەیەی بە دڵ نەبوو، گەیشتە گۆڕەپانی گوند، خۆیو کەرەکەی لە ئاوی بیرەکەیان خواردەوە، ئەمجا ڕووی کردە ماڵی [بۆزان ئاغا]، بڕیاری دا بچێتە لای و شکاتی حاڵی خۆی لە [ئەبو عومەر] بکات، بەڵکو ئەم ئاغایە گوێی لێ بگرێ و بەزەیی بە حاڵیا بێتەوە.

هەر لەنهۆمی یەکەم دا سۆڵەکانی داکەندو دارەکەی بە دیوارەکەوە هەڵپەسارد، ئەمجا بەرەو دیوەخان بە پلیکانەکانا سەر کەوت.

دیوەخان جمەی دەهات، چاوی بە دوو ژەندرمە کەوت لە ژەندرمەکانی مەخفەری [ڕاچۆ] تفەنگەکانیان پاك دەکردەوەو فوویان بە لوولەکانیا دەکرد بۆ ئەوەی ترس بخەنە دڵی جوتیارەکانەوە. ڕەشۆ وتی: «سەلامو عەلیکوم»، لە هەر چوار لاوە سەڵاو سەندرایەوەو بە خێر هاتن و ماندوو نەبوونی دەستی پێ کرد بە شێوەیێ فریای وەڵام دانەوە نە دەکەوت، لە شوێنی خۆی دانیشت و چاوە کزەکانی بە دیوەخان دا گێڕا... ئەوە بۆزان ئاغایە، ئەوەش حاجی فەرەیدوونە، ئەی ئەوە؟ نەی دەویست بڕوا بە چاوی بکات، چونکە ئەمەیان ئەبو عومەر بوو «چ شەیتانێ گەیاندی یە ئێرە؟» ئەمجا وەك کۆیلەیێکی دەستە پاچە چووە نێو قاوغەکەیەوە «ئیدی نە بۆزان ئاغا فریام دەکەوێو نە ئەو دوو ژەندرمەیەش، چونکە دیارە سوودێکی تایبەتی کۆی کردوونەتەوە» لەم کاتەدا دەنگی سڵاوێکی تر هات، ڕەشۆ لە تەنیشت دەرگاکەوە لە نزیك پێڵاوەکانەوە دانیشتبوو، چاوی بە کابرایێ کەوت چاویلکەکەی هاتبوە سەر لووتی، فێستێکی سووری لەوەی [ئەبو عومەر]ی لە سەر دا بوو، گوێی لێ بوو یەکێکیان وتی:

[ئەهلا.. ئەهلا جمعە ئاغا]، تەنانەت یەکێ لە ژەندرمەکان ئاوی دایە خۆی لە بەری هەستێ کاتێ کابرا پشتی کردە ڕەشۆ ڕووی کردە لای سەرووەوە، دیوەخان بێ دەنگی یەکی بە خۆیەوە بینی. هێندەی نەبرد ئەم کابرا پیرەمێردە لە بەردەمی ئەبو عومەردا چەمایەوەو کەوتە ژماردنی لیرەی زێوین، جارێکی کەش خەڵکەکە گوێقوڵاغی زرنگەی لیرە بوون... ئەوە پەنجا.. ئەوە سەد... ئەوە سەدو پەنجا... ئەوە دوو سەدی تەواو.

ئەبو عومەر هەستایە سەر پێو هاتە لای ڕەشۆوە و کێشی کردە دەرەوەی دیوەخان، چرپاندی بە گوێی دا «پیرۆز بێ نێت». ڕەشۆی حەپەساو وتی:

- چی پیرۆز بێو بۆچی ئەبو عومەر ئاغا؟

ئەمیش پێکەنینی بە گەمژەیی ئەم پیرەمێردە هات، بزەیێ هاتە سەر لێوی و کردی یە قاقایەکی شەیتانانە، پاشان وتی:

- کەرەکەت لێرە بەجێ بهێڵە، من لە گەڵ خۆم دا دەی بەمەوە.

کابرای سووخۆری چڵێس دەستێکی بە پشتی ڕەشۆدا کێشاو وتی:

- بڕۆ... تۆ ئێستا ئازادی ڕەشۆ ئاغا.

تێبینی: بۆ ناسینی فاتح مدرس و بەرهەمی ئەدەبی ئەم نووسەرە تکایە بڕوانە گۆڤاری [بەیان]، ژمارە [١٥١] ل [٥٩]

# کـــەومـــار

[ پێشکەشە بەو برا ئەدیب و رووشنبیرانەی
کە دەمێکە خێکام بە ئاڵ دەبینن لە
ئێوارە دانیشتنەکانی شارە دێرینەکەمان ]

● عەبدوللا سەراج ●

«ئەئاوهـ . . دە بیخۆ، دەی . خۆت ڕاوەشێنە هەی کافر. ئاوها دەتتۆپێنم . »

کوشـــتــم . کوش ش . ش . ش . تم . م . م . م . دەڵــە دێـوەکـەم کوشت ؛ تۆپـانـدم و رۆحـە ناپـاکـەکەیم بە دۆزەخ سپـارد . خۆ ئەگـەر بڕوام پێنـاکـەیت فەرمـوو. ئەوەتانێ لچ و کەپـوویم ئاخنیـوەتە ناو ئەم پڕیاسکەیەوە . گرێکانی بکەمەوە؟ بەڵگـە لەمـە بەرچـاوتـر دەبێت!؟ لچ و لووت و گوێ‌یەکانی . وەلێ گرنـگ کوشتنـەکە نی‌یە بەڵکو ئەوەیە بپرسیت بۆ کوشتم؟ چی پێی پێـوە نام؟ ئەوپرسیـــارەم مەبـــەستـە ، دەنـا دەیـان چەنـەنگی و دلێری بە فیڕوو چوونەو دەچن . سەر ڕامەوەشێنەو لە دڵی خۆتا بە هێنە بزانیت! «دە سێرکە ئەم کابرایە لە وەهمدا دەژیت!» هێن ومین نیم ، ئەگـەرچی گشتمـان لەنـاو چێـوەی وەهمـــدا دەگـوزەرێنین! وەهمێکی پیـرۆزو خەونێکی ڕەنگـاو ڕەنگ ، چونکە ژیان خۆی لەخۆیدا وەهمەو گەڕانەوەی نی‌یە . چرکـەو خولـەکـەکـان مانـەنـدی تاڤگەو تیژاو؛ بە خوڕ دێن و دەکشێن و هەرگیـز دوویات نابنەوە . ئێمە دڵۆپەیەکین دەتکێینە ناو زەریـــای کاتـــەوە . تۆ وەهمیت . . ئەز وەهمم . . دێـویش وەهمـە . بەڵام جوانتـرین ڕاستی لەوەدایـە کە دڵنیـاین ژیان و ڕۆژگـــار وەهمـــەو بوی تێدەکۆشین!! دەبـزانـە لە چ کاتێکی ڕیـویلەو سۆزانی دا. تەمەن بە سەر دەبەین!! ترس وەکو بەردە ئەستی ، بە هەموو جۆرەکانیەوە، لە ئەستمان دا کەڵەکەیە .

ترســـی دوا ڕۆژ . . ترســـی برسێـتـی . . ترسـی مەرگ و دۆزەخ . . ترس لە تاریکی و خێـوو کەڵبـە تیـژکـان . . ترس لە ئەنگـەشـەوو سوورە هەتـاو!! ئا . . . دەڵـە دێـوەکـە پشتی لە خۆرەتـە بوو ، مەمکی ڕاستی هەڵدابووە سەرشانی چەپی . . مەمکی چەپی هەڵدابووە سەرشانی ڕاستی . . هەریەکەیان لە شێـوەی تەنگـە دەستڕێك! بزانە . وەهمە گەورەکە چۆن لەنێو ئەسەی مێشکمدا خڕ بوتەوە! حنۆکەو مۆتەکەو شەیتان و . . . شەیتان . شەیتان . بە لە شەیتانەوە داوی گرۆنەکەت بۆ هەڵکەمەوە .

لە شەویکی نوتەکدا دەستم لەگەڵ شەیتانێك تێکەڵ کرد ؛ بەو نیازەی بگەمە دوڕگەی زێڕین! وامزانی دەست دەگرمە سەر نهێنی‌یـەکـانی سیمیـاو خیمیاو کلاوی «سحری‌جن»، کەچی سەرتاپای وەهم و تەراویلکەو تەم بوو! ڕۆبۆتێك بووم هی پارە کۆکـردنـەوە . تۆبا خاوەنی گەنجینـەش بیت، چ سوود ئەگـەر خاوەنی خۆت نەبیت!! کەومارێك بووم لەو گۆڕە . بەبیست و پێنـج دینـاری، کێنت و دیمـۆرێی سۆزانیم دادەگیـرسـاند . ژوورەوەم بێ‌گیان بوو، پڕ لە وردە جەڕی ژەنگن و پلاستیك و گریس . . ئەوبێ خزان و لێژ بوونەوەیەم بۆ ناو چڵکاوی کێم و دزێوی ، تف کردنم لە تۆپەکەی وەستا ڕەجەب ؛ ئەمانە گشت تووشی ئازاری ویـژدانیـان کردم ئەمێـستـا دەڵێم بنیـادەم خۆی شەیتانۆکەی خۆیەتی . دەبزانە ، هەمان وەهمە! ماوەی حەفت ساڵ گیـرەی «مـەیگـەیـە» خۆ خواردنـەوە مێشکمی دەگوشی و ئەشکەنجەی ناخمی دەد

چۆن نـسکـــوم دا کەوتمـــە ئەو چاڵـەی کەکـەس بەحیلیم پێنـابـات! بگـرە لە پاشەملەدا ، توانج و تەشەرم تێدەحیوێنن و تف لە سێبەرە کرێتەکەم دەکەن . مرۆ لەبارێکی ئاوهادا کەولی درنـدەشی پێ ڕەوا نی‌یە ، تەسانـەت کاژی ئەژدیهاشی بەبەر تەنگ و ناقۆڵایە . هەستم دەکرد منی گوێەنلە بوومەتە کانگای ڤایـرۆسی ئیـدزو ڕەشـە ڕشـانـەوەو شێـرپـەنجەو سوزەنەکی . هەستم دەکـرد جۆرە مۆرانـەیـەك لەژێـر پێستمەوە جموجووڵ دەکـات . سرەوتم نەبـوو، وەك ئەوەی ملچێـوکی خەونخوونی بەچـاومـا کێشـرابیت! دەڵێن گوایـە پەری هەیـە خۆی دەکاتە کۆتر و ئەو ملچێوکە بەچاوی عاشقاندا دەهێنێ! خۆ من سەودا سەرو عاشق نەبـــووم! گوڵـــەبـاخ بۆنی درنی‌ی دەدا! خۆراك چێژی گوژالکی هەبوو! سرۆشت لەچاومدا ڕەنگی نادایەوە!! جریـوەی مەلان لەگـوێمدا دەنگیان نادایەوە!! چارە!؟ ئەشك بڕێژم و حەفت مەنجەلاك تژی‌کەم! نا . . نا، ئەوە خاوێنگەم نی‌یـە . دڵنیـا بووم لەوەی کە بڕیـارت لەمـەر کارێـك دا ، هەر بەئەنجامی دەگەیەنی . مەرج ئەوەیە نەبەزیت ، چونکە هەستە نادیـارەکـانی ناوەوەت پەلـەکێشت دەکـەن بەرەوئەو ڕووگایە . مرۆڤ وزەی زگمـــاکی زۆرە کەهێشتـاکـە نەدۆزراون . بۆ ئەو ئاکـــامـــە ، ئامـــادە بووم گشت سزایـــەك بنۆشم . شەووڕۆژ بەخۆمدا دەچوومەوە . کەسانی وەکومن دەشێ لەمیهرو ئامێزی گشتی نائـومێـد بن و ئەوەش پتـر بەنـاخی بەدکارێدا بیانبات! دەمـــویست پاکـــژ ببمـــەوەو لەژانی هەراســـانی ڕزگـاربم .

دەمویست لەژیانەوە هەنگاو بۆژیانێکی دیکە هەڵنێم. ئا.. لەژیانەوە بۆ ژیان.

نموونەی دیش هەن کە لەسنوور بەدەر وێڵ و سەرلێشێواوو گومڕا بوون. ئای، چ دۆزەخێکە دادگای ناخ و دەروون. ئای، چەند بەختیارو سەرفرازە مرۆڤی خاوێن و ساکار.

ئەو سۆسەو لێکدانەوانەم تووشی زیندە خەونیان کردم. بەدەم ڕێگاوە خەونم بە دەربازبوونەوە دەدی، کەشەویش رادەکشا، دەبوومە قەرەوڵ و تفم لەتاریکی دەگرت هەتا خەو دەیبردمەوە. شەوێك خەونم بینی. کێ بێتە خەونم باشە!؟ هەرچەندە مێشکت بخەیتە کار؛ ناوی نایەتە سەرزارت. چونکە هیچێکمان ڕوخساریمان نەدیوە، بەتەمەنی ئێمەیش نی یە. ئەو پێغەمبەرە چەند سەدەیەکە، سەر بڵندو بەختەوەرانە، بەخاك شادبووە. دەزانی مام ئەحمەدم هاتە خەو! کام مام ئەحمەد!؟ بۆ لە حەزرەتی خانی بترازێ، کەسێکی ئەوتۆمان بووە دەنگی زوڵاڵی هەندەرانی سەرسام کردبێ! وەکو خدری زیندە مووی سەروڕدێنی چەرموو بوو. خاوێن وەك بەرگە سپی یەکەی. لەپی سۆزی بەسەرما هێناو گوتی:

«هەتوانی زام و دەردی تۆلەکن منە» وەخت بوو باڵ بگرم.

«.. دەبێ بە خاوێنگەیەکی ساماناکدا تێپەڕیت.»

گوتم: «کێوی قافم بۆ پەنجە نمابکە دەچم. قەڵاتی تەلیسماویی درنجانم بۆ دەست نیشان بکەیت، بەچنکەڕنی پیادا هەڵدەگژێم».

گوتیەوە: «ڕۆڵەکەم. بەوە باگژ دەبیتەوە کە دێوی بۆر بکوژیت».

پرسیم: «خاڵە.. دێوی بۆر لەکام قوژبن و ئەشکەفتی ئەم زەوی یەدایە!؟»

ئەو بەرووبەکی ڕەندەوە حەیدە گارانی کردم.

«دێوی بۆر والەنێو جەنگەڵی کەسکدا، لەژێر درەختێکی چل گەزی گەڵا سێگۆشەیی دایە. چڵ و لقی دارەکە بەبێچووە ئەژدیها دەچن».

من حەپەسا بووم..

«جەنگەڵی کەسکیش لەو دیوی کێوی ڕەشە. کێوی ڕەشیش وا لەڕۆخی ڕۆژهەڵاتی زێی سوور».

وێجا دەمی نووقاندو.. نەما! لەخەو ڕاچڵەکام. «زێی سوور! کێوی ڕەش! جەنگەڵی سەوز! دێوی بۆر! پەلکی سێگۆشەیی و درەختی چل گەز!!» کەوتمە خۆم. دەبێ ڕێگای هات و نەهات بگرمە بەر. توێشووم لە چاروکە کەونێکی نەنکم ئالاندو لە کەمەرم بەستا. کەوشی چەرمە گامێشم لەپێ هەڵکێشا. هاتێرەو هاتەوێ. شەوم دی. ڕۆژم کردەوە زێی سوورم بری. سوێندم خوارد بە؛ ئەگەر دێوی بۆر نەکوژم نەگەڕێمەوە. ڕۆژێك، لەپێچی کوڵانێکدا بەردەسرێژێك کەوتم. لەناو خوێنی خۆما گەوزامەوە. کەسێك بەهانامەوە نەهات ڕوحم بە لەشمی گوت: «نەکەیت بمریت، چونکە مردنێکی ئاوها هیچ ناگەیەنێ! شوێنەزای دڵۆڤانیش نەفرەتت لێ دەکات و... خاك گۆڕەو شارت دەدات». بۆیە تەکانم دایە خۆم و ڕاست بوومەوە، هەر ئەو دەمەش بڕیارم دا کە بچاوێن بیمەوە، دوای ئەوە مردن براگەورەی هەموو نە، ئ!..

پێشەکی لە لێواری زێیەکەدا هەستم نە ڕووبەری ئوەکە ڕاگرت و ئەوجا گەڵاو پووش و پەڵاشم هەڵدایە دەم ئوەکەوە بۆ دیاری کردنی خولگەو گێژنگەکان. دیتم جنەیەکی خوێنمژ پەیتا پەیتا پەلەکانی بەسەر ئاوەکەدا دەگێڕێ. من نەجنەو دەعب بترسم! جلەو دەعبا بووم. نەوگوزەرەدا، شەش حەوت جرجە کوێرەم گرت پاش ئەوەی بە لقەدارێك کونەکانیانم هەڵدڕی. ڕووت بوومەوە. جل و کەوشەکەم بە چروکەکەوە نەبان سەرم توندکرد. دەستاوێژێك جرجەکانم تور هەڵدا. جنەکە جمە بەرەو جرجەکانی ناو گێژنگەکە. من بەهەنم زێی وبەپێ مەلە پەڕیمەوە برۆ. برۆ.. برۆ، پاشکۆی شەوە بە پێشەنگی گزنگەوە گرێدا. هەندەم زانی هەورازی کێوی ڕەشە. لەبەر خۆمەوە خۆم دواند «چۆن نە زێی سوردا جنەوگێژەنگە هەبێ ئەڵبەتە لەم کێوەشدا درنجێك هەیە. دەبێ چیم بێتە ڕێ! کوڵلارەی هەردوو چاوم فڕین. نە دووررا گورێسێکم دی شۆڕ بووە خوارێ!! دەسبەجێ هزرم نەوتیە مێردەزمەی حەکایەتێکی نەنکمەوە. هەر زوو چەتەوێنێك نەتیمری بەڕێکە ڕێیەکەدا پێشوازیی کردم.

- «ماندی نەبی پیرۆت. ئەوە کێوە دەچیت؟»

- «تۆ بزانی پیرۆتم ناوبێ، دەشزانی بۆ کوێ دەچم».

گوتیەوە: «دەوەرە بان پشتم بتگەیەنمە نەوەندی جەنگەڵی کەسك».

ئەوەی گوت و دانەوی. سەرنجم دا وا کنکۆکەیەکی بەپاشەوەیە! گورج نەنکم گوتەنی دەستم بۆ دوخینەکەم بردو.. گرێکەم ترازاند. مێردەزمەکە بووە نووسە دوکەڵ و

هەڵکشـا. پرزەم هاتـەوە بەرو سەر سەختـانـە هەنگـاوم هەڵهێنـایـەوە. گوێم نەدایـە بەستـەڵـەك و ڕەوەزو هەڵەمووتی هەزار بەهـەزار گوێم نەدایـە جنـۆکەو تارمایی و تاپۆ. هەندەم زانـی وام لە تروێـکـی کێـوی ڕەش. هەتـا چاو بڕکـات لێـرەوارێـکی بەرین و چڕم لێـوە دەرکـەوت، چوومـە سەر قوتکـەیـەك و لەوێـوە، جووتێ کێشـەکـەی ڕەنـگ ئاوی لە ئاشیـانـەی دیـدەکـانمـەوە چوون بۆ ئاسمـانی جەنگـەڵەکە.

ئاسمانی جەنگەڵەکە زەریایەکی کوژەکە بوو.

«هـەر دەبێ بڕۆم. سەرێکـە هێنـامـەو نایگێڕمەوە. ئەمەیە دوو ڕێیانی پرسیارە ئەزەلییەکە.»

بەدەم شۆڕ بوونـەوەدا، دیمـەنە تۆمارەکانی هۆشم نوقرچیان لە گیـانم گرت. ئەوەتـانێ بارانی زەردە چەوە. ئەوەتـانێ سەر ژمێـری دۆم وقەرەجەکان پتر دەبێ. چاڵە دانەوێلەی هەتیو.. پەرەی ئەتـك کراوی بن بنچکـان.. زارولـەی فێدار.. بزەی تۆراو.. گریـانی بێـدەنـگ. شەبـەیخـووتی بزنمـژۆك و کوڵـەوەیبـاب و گۆڕهـەڵکـەنـە. ئای چەنـد ئاسانە ستووندەی ڕەشماڵ بکەیتە سێداره، ئاسانە وەك پاروو گلاندن و پەیڤ ڕێز کردن، وەلێ کێ داری سێدارەیەك دەکاتە لانکەو شەقشەقە بۆ ژیرکردنەوەی کۆرپەیەکی خەوزڕاو. سیم دەبێتە تەڵبەندو هەم دەشبێتـە دەرزی و ئەموستیلە. سەرتان نەیەشێنم نشێوام بری. دیتم وا لەژێـر درەختێکی بڵنـددا، دەلـە دێـوێکی بۆر پشتی داوەتـە خۆرەتـاو. لق وجڵی درەختـەکـە بە تووڵـەمارو بێچووە حەزیـ دەچـوون! کە با هەڵیـدەکـرد، گەڵا سێگۆشەیی یەکان فیشکـەیـان لێوە دەهـات. لەپـەنـای کۆتـەرە دارێکـدا خۆم مەڵاس دا، دێـوەکـە خەوە نوتـکـێ ی بوو. مەمـکی چەپی هەڵـدابـووە سەرشانی ڕاستی و مەمکی ڕاستی هەڵدابووە سەر شـانی چەپی. مەمـك چ مەمـك! هەریـەکـەیـان وەکـو تای دەستـڕێـك!! مەمکی ڕاستیم توند توند گرت و گوێـەکەیم لەچـەشنی کۆرپەیەکی ساوا مژی. مژیم.. مژیم.. مژیم هەتکو هەناسەم سوار بوو. نەنکم دەیگوت.

«کە مەمکی دەلە دێوت مژی بە کوڕی خۆیت دەزانێ بەلام لەهەنجەت و پەنپ دەگەڕێ بۆ ئەوەی بتکاتە ژەمێکی خۆی».

دێـوەکـە نەڕەیەکی لێوەهات. ئاخێکی هەڵکێشاو هەناسەیەکی دایـەوە. لەدەم و کونـە لووت و گوێیـەکانیەوە دوکەڵ دەرچوو! دەنگی بەڕمن و هەڕەسی ڕنووە بەفر هاتە بەرگوێم

«بەسە. بەسە، هەی بنیادەمی زۆر زان، وازبێنە کوڕم، دەنا دەمخستیتە ناو کلۆری دگانمەوە.. دەی برۆ بێژنگێك ئاو لۆ دایەی خۆت بێنە.. زۆرم تینووە.»

بێـژنگم هەڵگـرت و چوومـە گوێی ئاوەکـە پشتێن و مێـزەرو چارۆکەکەی نەنکم لەئاو هەڵکێشان و نامنە ناو بێژنگەکەوە.

«دەی زارت بکەوە».

ئەشکـەفتی زاری دابچڕی. چارۆکەو مێزەرو پشتێنەکەم، یەك لەدوای یەك گوشینە گەروویەوە.

«ئۆخەی.. هەناومت فێنك کردەوە هەی گوڵەکەی ڕۆحم.. وەرە باوەشی دایکت».

نووساندمیە خۆی و هەندەی نەخایاند؛ خەو بردی یەوە. دەنگی نەنکم لەگوێمدا زرنگایەوە.

«ڕۆڵـەکـەم، دێـو ڕۆحی لەنـاو کودی دەنێ و شەوان بە باز سەرییەوە هەڵیدەواسێت».

خۆم لەبـاوەشی وەر سووڕانـد. لەخەوێکی قورس دابوو. نیگـام نارده نێـوان پەلکـە نوشتەیی و لقە مارشێوەکان. گەشکە بووم. کودییـەکـە بەلقێکی نزمـەوە تەکە تەکی بوو!! واچاکە شەوو ڕۆژێك لەکنی بمێنمەوە بۆئەوەی دڵ کرمی نەبێ متمانەم پی بکـات. وەراوردم کردو لەتـەکیـا خۆراکی دێـوم خوارد! گۆشتی کیسـەڵ و هێلکـەی کونەپەپوولەگەڵ هەزارپێ و شیری سیخـوڕ. ئای کەشـەوانی جەنگەڵ چەند سامناك و ئەنگوستە چاوبـوو. شەوی یەڵدابوو! شەوی دووەم هەر زوو خۆم خستە خەوو بەتیـلایـی چاو ڕوانیـم دەلـە دێـوەکـە دوو سی جار کودییـەکـەی ماچ کردو لە شوێنی خۆی دانـایـەوە. لەنـەکم ڕاکشاو زوو کەوتە مرخە مرخی گرانە خەوەوە. بەئاسپایی خۆم لەتەکی دابری و بەچوار پەلە خزامە پاڵ درەختەکەوە. لەوێوەش چەنـد وردە بەردێکم هەڵـدا بۆ ئەوەی بزانم بەئاگادێت یان نا. دڵنیـا بووم بە زوورنـاش ڕانـاپـەڕێ. دەستم بۆ کودییەکە بردو یەکسـەر بەتوندی و جەختەوە ڕاموەشاند. هاوارو پاڕانەوە لە دەلە دێـو بەرز بۆوە. «نـەکـەی.. وامـەکـە کوڕە شیـرینـەکـەم. لەجێگای خۆی دانێ و وەرە ماچێکم بدەرێ. هانێ ئەم کلاوە زێـرەت بدەمێ. ئەمێش پێـلاوێکـە کە لەپێت کرد وەکو مەك دەفڕێت.. تو واز لەو کودییە بێ فەرە بێنە...»

ئەلـەتـە خۆم لێ کەڕکرد وتینی دەیان ڕەنجدەرم لەمەچەکم دا نۆکـردەوەو.. هەتـا هێـزو شنگم تێدابوو، کودییەکەم کوتایە سەر گا بەردێکی بن درەختەکە. دێوەکە بەگوێرەی ڕاشلەقاندنی کودییـەکـە لەتـری داو.. خولایـەوەو.. ڕمـایە سەر زەوی. ئەمنیش گەڕامـەوە.. کەوشـەکـەم دڕاو شەرمـەکـەم سرا.. قەرموون، ئەوە لچ و گوێ و کەپووی دەلە دێوەکە لەم پڕیاسکە دایە..

# چیرۆکەکا فۆلکلۆری

ئەحمەدی حاجی ئامەدی

دبێژن جارەکێ هەبو نەبو بازرگانەکی ترک دژیا ناڤێ وی حجی مەحمەد بوو شوولێ وی بازرگانی بوو تەمەنێ وی گەهشتبوو چل سالی هێشتا ژن نەئینا بوو نەگەرا ژن نە ئینانا وی ئەو بوو گەلەک یێ قەلس بوو یان هەکو دبێژن یێ چریك بوو جارەکێ ئەو بو دەرەکێ خو ژ ئاڤ بازاری ئانی بو مال بو دەرێ وی گوتێ حجی مەحمەد تو بوچی ژ ژنا نائینی دا خوێ زارۆکەکێ خێری بدەته ته ئێنا حجی مەحمەدی گوته بو دەرێ خو تو بکێت حەس کو شیب من بکەت ئو ئەز لڤێ چو بیینم ئێنا بو دەرێ وی گوتی دێ کچا جیرانێ ته ئەحمەدی خوازین ئەو ناڤێ وێ عەیشو بیژن مەحمەدی گوتێ خوش شوله بیژن چوون کچا خوست ئو کچك دایێ دەست هاڤیتێ داوەت خوکرن بیژن ژ قەوۆیت چیروکا هەفت سالا خودێ چ بچیك نەدا ێ. بیژن وەختی عەیشوێ شیب مەحمەدی کری گەلەک بەرکەتی و یێ جان بوو. جیرانەك هەبوو ناڤێ وێ عەدلا بوو. عەدلێ گوتە عەیشوێ مال خراب عەیشا تو بەرێ شیب مەحمەدێ بکەی تو چەندا جان بوی ئو نوکە تو هوسا بێچارە بوی. ئێنا عەیشوێ گوتی هی ی عەدلا نەڤە سەرێ حەڤت سالا نە هێشتا من گوشت نەخاریەو نەخدئیلا من بێهنا گوشتێ ژ مالێت جیران هەتبیتە من. ئینا عەدلوی گوتێ عەیشێ خودێ ژ بام ژناوی ڤانا حەفت سالا پاشێ بلا وی گوشت نەئینابا بێژن گوتێ عەدلا پ خوزی تە شی یێ کرب.

عەیشو رابوو خو نەساخ کر حەتا حەجی مەحمەد ژ بازاری زڤری وەختێ حەجی دیتی کو ژنکا وی یا نەساخە گوتێ تە چی یە ژنکا وی گوتی حەجی ئەز نەیا نەساخم بەس ئەز هزرا تەدکەم ئەڤە حەفت سالە تە ئەز نینایم هێشتا خودێ چ بچیك نەداینەمە هەکە خودێ نەکەت تو مری دێ ئەڤ مالێتە هەمی بو مروڤێت تە مینیت ئەویت هند تو نەڤێ ی ڤێجا ژ من ڤە نزنە تو بخو ژنەکا دی بی نی. ئینا گوتێ حرمەت مائەز دێ بخو کێ نینم گوتێ هەمە بخو عەدلوی بینە بەلکی خودێ بچیکەکێ خێرێ بەرەتە، بێژن ژ قەولێت چیرۆکا عەدلو بخو خاست و نینت. وەختێ داوەت بریعاهی هاتی حەجی مەحمەدی گوتە هەردوو ژنێت

خو موخـلێ بینن دا بو سبەهی ئاری بکەمێ بێژن عەدلوی موخل بر حەجی دوو لەپێت ئاری کرنێ بێژن ئەوێ ئاری سێ

نان کەتنێ هەر ئێکی نانا خو بترس خار، ئو حەجی قەستا بازارێ خوکر. عەدلو رابو چو دەف قەسابەکێ دەهـ کیلوێـت گوشتی نینان نو گوتە قەسابی سەر حەجی بنڤێسە ئو عەدلوی قەستا مالا کر، ئو رابـوْن تێر گوشتێ خو خار ئو گوت بلا حەجی ژی خوی بێ بخوت، بێژ ن هەر عەدلو دا چیت تشتا کریت دا بێژ یت سەر حەجی مەحمـەدی بنڤێسن، بێژ ن خەنـکـی ژی دەینیت خو ژ حـەجی نەت خستن چنکی مروڤەکێ زەنگین بوو. شەرم دکر زێب زیاتی پارێت خوْ ژێب خازن روژەکێ عەدلو عەیشوێ خازنێ دخون عەدلوی گوتێ دڤێت ئەم تشتەکێ ببینە سەری حەجی بەری خەلك پارێت خو ژێب خازن. عەیشوی گوتە عەدلوی مادێ چێ کەین.
عەدلوی گوتی عەیشا تو خو نەساخ کە ئوسێ بسکێت گوشتی بژ یرە ئو دانە نیك خوْ وەختێ حەجی تێت ژ بازاری ببینت ئەو گوشتێ لوێری پا ئەڤە حەفت سالە حەجی گوشت نەخارە ئەو دێ چیت بستکـەکێ خوت تو دەی نەکە هەتا تو دزانی وی بستکا خو هەمی خار. تو بکە ڤێری و سەرێ خوْ ڤەچرە بێژە وەیلامن ری رەشی شەرمزارێ حەجی دێ بێژیتە تە عەیشا مال خرابێ منن بستکەکا خاری هێشتا دوو یێت ماین توب بێژ ی حەجی من نەژبـەر گوشتی بو نەوێ ئەز چوو بومە سەر مەزارا من بخو داخازا بچیکەکێ کربوْ ڤێجا دەرمانێ من ئەو سی بسکێت گوشتی بوون تو هاتی تە خارن نەس ترسم تە بچیکەك ببیت. بێژ ن عەیشوی گوتی ئەڤە خوش شولە، دمێ بویە نیڤ ڕۆعەدلو چو مالا جیرانا بو داپیرکا ژنکەکێ.
ن نێزیکی ڕوژ ئاڤـا بحەجی قەسـتـا مال کر وەختێ چویەت ژوورڤـە بەرەحـەدەتی عەیشو یان ناڤ نڤینا ئو سێ بسکێت گوشتی یێل دەف عەیشوی وەختێ حەجی ئەو گوشت دیتی بەری بستکەك هەلگرت ئو خار وەختێ خاری عەیشوی کرە هەواروەی لمن ری رەشێ شەرمـزارێ حەجی ئەڤـە تەچکـر نینحەجی گوتی عەیشا نەکە هەوار من بستکەکا خاری هێشتا دوو یێت ماین. عەیشوی گوتێ حەجی ئەز گوری منەش بەر گوشتی‌یە بەوێ ئەز چوو بوومە سەر مەزاری من داخازا عەیانی کر بوْ ڤێجا دەرمانێ من ئەو سێ بسکێت گوشتی بوون من گوت پاشێ دێ خوم ئینا تو هاتی تە بەری من خار ڤێجا ئەز ترسم تە عـەیالـەك ببیت. حەجی گوتێ عەیشا مال خراب زەلاما چاوا بچیك دبن عەیشوی گوتێ حەجی هەمی شون ژ خودێ تێت. بێژ ن پشتی هنگی حەجی گەلەك عێجز بوْ ئو کەتە هزرا نە نڤست بێژ ن ئوچەند دەنگەك ژزکێ حەجی تەت ژ ترسادا نەت نڤست. ل درەنکی شەڤێ خەوێ حەجی گرت وەختی خەوێ‌گرت. بێژ ن هەر لوێ شەڤێ ژنک جیرن ورت خودێ کورەك دابی ئو عەدلـویا ژناحەجی داپیرکا جیرانێ‌یە نیڤ شەڤ عەدلوی کورك دانا سەر دەستێت خو ئو هاتە مت گوتی عەیشـا چ حالە تە ئەو تشت گوتینە حەجی ئان نەء.
عەیشـوی گوتێ هەماهشە منێ بز دانری ژترسدا بیت حەو چوی، عەدلوی گوتی پارێ رابە دابچینە نیك حەجی ئینا هەر دووك بچیك بروو چونە نیك حەجی. رابون دخین حەجی ئینا خارێ تو کورك دانار ناڤ دەرپێ وی دا.
عەدلو رابو خو ڤەشارت و عەیشو ژی مان سەر جهێ خو دوەختـەکێدا حەجی هشیار بوو هزرا خوکـر تشتـەکێ ناڤ دەرپێ ویدا ئینا دەستێ خو برە ناڤ دەرپێ خودا دەستی وی بسەری بچیکەکێ کەت. حەجی ژشەرمێت خودا هەما رابوْ نو رەڤی کورك د دەنگی ویدا کەت. بێژ ن عەیشـو ب بەر زڤـری گوتی حەجی نەچـە دێ ئەجنـە تە هنگێڤن تو یێب زستانی. حەجی گوتێ عەیشا ژنك دبێ بەختن هێن دێ بێژنە ڤی باژێری هەمی یێ حەجی کورەکێ بوی ئەڤە ئەزێ چووم من حەرام ببیت ئەڤ بژێرە پشتی حەجی چویی عەدلو زبو جارەکـا دێ کورك برە مالا خرانـا ئو هاتە ڤە. عەیشو چوو سەرێ عەدلوی گوتی سەحەت تە خوش تە بەلا ڤی نەمەروێ ژمە ڤەکر. پشتی هنگی شولا عەدلوی ئو عەیشوی بەس بو گەشت خارن.
بێژ ن حەجی مەحمەد ب دنیایێ کەت بیست سالا قەست مان نەکر. ئینا روژەکێ حەجی کەتە هزرا مێ خو کوت ئەز دێ رابم قەستا مالا خوکەم نوکە خەلکی ئەو تشت ژبیر کریە وەختێ نێزیکی باژێرێ خو بوی بەرەخەدایی دوو بچیك یێت سەرا کابـە بەکێ کەفتین ئێك یێت بێتە ئێکی ئەڤە کابێ نە ئێکی گوتە یێ دێ‌کەرت بابێ درەوین ڤە هەکە ئەڤ کابە ژوێ روژا حەجی مەحمـەدێ کور بوی ئەڤە ل مالا مەبو وەختێ وەسا حەجی گوت وان بچیک بوی ت سەر پێ خو زڤری ڤە گوت مادەم بچیکا بخو کربیتە مێژ و شولا من ئەڤ باژێرە نینە. بێژ ن ئەڤە ژوێ روژێ هەتا نەڤرو قەستا وی باژێری نەکریە ڤە ئەز ژی هاتمە ڤە چ نەدا من.

● ئەڤ چیروکە من یازاردەڤی ژنەکی وەرگرتی‌حەلکا دەڤەرا ئامیدیی‌یەو ژێی دێ‌نێزیکی [٥٨] سالە.

# بابەتێکی ترسناك

نووسینی :
رافاییل ئەلبرتی

وەرگێرانی لەئیسپانی‌یەوە بۆ کوردی :
محمد کاکەیی

کەسەکانی ئەم شانۆنامەیە :
نیگارکێشی X) کچێك
نیگارکێشی K) کوڕێك
نیگارکێشی B) ژنێك
ڕەخنەگرێك سەرۆکی کۆمەڵەی نیگارکێشە
ئازادیخوازەکان بینەران .

## پەردەی یەکەم

**دیمەن :** وێنەگایەکی نوێی نیگارکێشان . دەرگا لە لاتەنیشتێکەوەیە . بە دیوارە لووسە ڕەنگاو ڕەنگەکەوە تابلۆی هەمەچەشن هەڵواسراون . لەبنەبانی وێنەگاکەدا سێ پایەك دیارە کە پارچە قوماشێکی پێوەکراوە وپشتی لەبینەرانە . نیگارکێش (X) ئاگای لەخۆی نی‌یەو خەریکی ئیش کردنە ، لەپشت تابلۆکە دیار نی‌یە . مێزو کورسی‌یەك دانراوەو ڕەخنەگرێك لەوێ دانیشتوە .

**ڕەخنەگر :** ـ[شووشەیەك مەی پەرداخێکی لەبەردەم دانراوە . بەڕوو خۆشی‌یەوە] : با دووەم جگەرەو چوارەم پێك مەی بنۆشم . . . کەچی هێشتا ئەتۆ خۆت لە پشت تابلۆکەت شاردۆتەوە ناشهێڵی لەجێ‌ی خۆم هەنگاوێك بزووم

**نیگارگێشی (X) :** ـ تومێکی تریشی لێ بدەو بیکە بەپێنجەم ، هەر چۆن حەز دەکەی وابکە . ئەرێ بەخۆشم نازانم بۆچ ئەوڕۆ بە دواتا گەڕام ، تابێتە لام خۆ کە لەکونی دەرگاوە تۆم بینی باشتر وابوو پێتم گوتبایە : «نیگارکێشی X مرد» . سبەینێ

چاوەڕوانی ئەو هەواڵـە لە ڕۆژنـامـەکـان مەپرسن چۆن ژیانی بەسەر برد. [پێ دەکەنێ].

**ڕەخنـەگـر**: ـ پێم ناڵێی کەی من تۆم نەگـەیـانـدۆتە پەڕگەی ئاسمان ؟

**نیگارکێشیX** : ـ خۆم شایستەی ئەوە بووم.

**ڕەخنەگر**: ـ ڕاستە بەڵام ئەوگۆڕانەی. . .

نیگارکێشی X : ـ ئەو گۆڕانەی نیشانەو مۆرکی سەردەمەکەمانن

**ڕەخنـەگـر**: ـ هێمـاکـانی پێشووت. . . مەدحی منیش ئەوسا زۆر گەورە گەورە بوون.

**نیگارکێشX** ئەرێ بەڕاست کەنیت بەو ڕێبازەی من دێت؟

**ڕەخنـەگـر**: ـ ئەوکـات وابـووو. بەڵام ئێستا بەخۆم دەزانم چ ڕێبـازێکم بەلاوە گرنگـەو تابتوانم بەرگری لێ دەکەم. کەچی ئێستا تۆ بەڕەنگێکی تر هاتیتە بەرچاوم. . .

**نیـگــارکـێـشـی X** : ـ [بـازی داوێ و تووڕە دەبێ] چی؟ بەڕەنگێکی تر؟ جا تۆ نرخت هەیە؟

**ڕەخنـەگـر**: ـ ببـورە. دەمەوێ بڵێم ئیشەکانت لەچاو ئەوانەی پێشـتـرت] وەك، کانـدینـسکی و پۆل کلی، لەیـەکتـر جیـاوازن. . . باشـە بۆئـەوەنـدی لە سەری بڕۆین؟ نازانم چ قوڕێکیـان بە سەرم دەکـرد ئەگـەر ئەو ڕۆژە منیـان لەسەر جادە دەست بکـەوتـایـە. . . بەڵام خۆ ساڵێك وەرنەسووڕایەوە، تۆ خۆت لەنـرخی خۆت دابـەزانـد بەو بەرهـەمـانـەی لە [هـۆڵی لاون]دا هەڵت واسین [نیشـانـە بۆ تابلۆیکی قەد دیـوارەکـەی دەکـات]. لەگـەڵ ئەوەش دا من هەمـوویانم بەدڵ بوو کەواتە لەوەزێتر بەتەمای چیت؟ [لێ دەچێتە پێشەوە].

**نیگارکێشیX** :ـ [بەناڕەزاییەوە]: دەی بڵێ، بەردەوام بە. . دوایی تێت دەگەێنم.

**ڕەخنەگر**: ـ تۆو ئەوانەی لەگەڵتان هەوڵ دەدەن کەس بەقسەم باوەڕنـەکـات. بەڵام ئەوە شتێکی ڕاست نییـە. ڕێبـازی ڕۆژنـامـەکـان تا ئێستـاش نەگـەیشتۆتە ڕێبازی سەرنج کاری [انطباعي]. دوێنێ شەو لەبارەگای نووسینەوە تەلەفۆنم بۆ کراو پێم وترا: «بەڵام پێشتر جەنابت تەنها ڕێبازی کلاسیزمی بەدڵ نەبـوو، بۆیـە ئاگات لەخۆت بێ و بەزۆر بە باڵ و شانی ئەوشتە شێتانەیان دا هەڵمەڵێ».

**نیگـارکێشی X** :ـ باشـە دوایی دەبینی چیت لێ بەسـەردێ [ڕەخنـەگـر وەبـەر خۆی دێنێتـەوەو دیسـان دەیەوێ لێی نزیك ببێتـەوە. نیگـارکێشی X) پێشی لێ دەگـرێ وفڵچەکەی وەکو شمشێـر بەرامبـەری ڕادەگـرێ] نا! بگەڕێوە جێی خۆت و لە خواردنـەوەو جگـەرکـێـشـانـی خۆت بەردەوام بە. . . .

[دەگـەڕێتـەوە سەرئیشی جارانی و مێشکی لەکەللەی نەماوە].

بەڵێ ئەمـە داوە نراوەتـەوە. . . باشە من دەمەوێ شتێك بڵێم. مانایەکی تری هەبێ، لەوەی پێشتر جیاواز بێ. . .

**ڕەخنـەگـر**: [پێ دەکـەنێ] ـ وەك ئەوەی دوێنێ یانیـو سەعات لەمەوپێش یادەقیقەیەك. . .

**نیگارکێشیX** : ـ باشە، پێ بکەنە هەر پاش دەمێکی تر دەیبینی چیم کردووە. دەتـەوێ لێرەببینی، ئەگـەر بە تالـووکـەنیت یا لەهۆڵی کۆمەڵە. . . ئالەبیرم نەبوو لێت بپرسم: ئەرێ دەزانی شتی گەورە شتی بچووك لە بیر مرۆڤ دەباتەوە؟ نیگارکێشیB) چی ئامادە کردووە؟

**ڕەخنـەگـر**: ـ ئەمـاشـەکـە. . . هێشتـاکـە نیگارکێشی B) م نەبـیـنـیـووەو ناشـزانـم ماوەم بۆئەڕخسێ یان نەء. بەڵام نیگارکێشیK هەر بەرهەمەکانی دەنێرێ ئەوە هەرگیز ناگۆڕێ.

شێوازێك بەکاردێنێ کە لەسەری سوورە. خۆ لە نیگارکێشانی گوڵ و وەنـەوشـەدا هەر مەپرسـە چلۆن پسپۆڕێکە: لەسەرخۆ وێنەیان دەکێشێ و ناوناوەش ڕەنگی ڕەش بەکاردێنێ.

**نیـگــارکـێـشـی X** : ـ کارێـکـی سەنگینـە. . . یەکخستنی شێواز. . .

**ڕەخنـەگـر**: ـ بەڵێ سەبـارەت بەنیگـارکێشی K) ئەگـەرچی هەمیشـە وەك جاران نەبێت، بەڵام دەستکـردەکـانی هەر لە پێشـانگـا تاقـە کەسییـەکانی ئەم دواییە دەچێ! دیمەنێکی ڕێـك وپێـك، لەگـەڵ چەپکێ چل وگـوڵ بەشێوەی هێڵێکی وەنەوشەی و چەند تاڵە هێڵێك ڕەنگی ئاسمان جیادکەنەوە. . .

**نیگـارکێشی X** :ـ ئاوایـە، چۆن وانییـە! کارەکانی لەناو پەڵە ڕەنـگ دا خنکـانـدووە. ئەمـڕۆ ئەوە فیلێکی زۆر باوە تاخـۆی لەهەموو تەنگ و چەڵەمەیەك لابدات. ئەوی نیگارکێش؟

**ڕەخنەگر**: ـ وەکو هەموو دەستکردەکانی تری خۆی، بەڕاستی بلیمـەتـە. مادەکـانی پارچـەیکن لەگیـروگـرفت و هونـەرە شێوەکارێکەی پڕاوپڕە لە بڕواو بە خۆڕاپەڕموون

**نیگارکێشی X** : ـ ئەوی بابەتی تابلۆکانی ؟

**ڕەخنـەگر**: ـ ئەمڕۆ تۆ زۆر پرسیار دەکەیت؟با بەتەکەی سەری

ئافرەتێکی گوندنشینە بەڵام ئەوە گرێك نی یە... . ئەگەر کەلوونی یا لوولەیەکی دروست بکردایە هەر وەك بەلووا بوو. گرنگ ئەوەیە... باشە... بۆچی ئەوەندە لەسەر ئەوە برۆین؟ هەر چەند رۆژێکی تر و هەڵدەواسرێن، ئەوسا بە چاوی خۆت دەیانبینی. ئێستا کاتم لە دەست مەدە بە ستایش کردنی تابلۆکان. بەڵام زۆربەی بەرهەمەکانیان ناهێنتە پێشانگا. زۆرزۆرهەشت، نۆ، دە نیگارکێش بەشداری دەکەن. وابزانم تەنها «ئاسەکان»ن...
[هەڵدەستێ] بەسیەتی، باوەڕم بەباشی دەزانم ئەوە لەهۆڵەکەدا ببێتە شتێکی سەر سورهێنەر لەناکاودا.
**نیگارکێشی (X)**: - ڕەنگە تابلۆکەم نەنێرم. ئەوەش لەسەر ڕای ژنێك ماوەتەوە. بزانم ئەگەر بیەوێ، ئەواباشە، بەڵام بەبێ ئەوەی بابەتی تابلۆکەمی پێ بڵێم.
**ڕەخنەگر**: - پیرۆز باییت لێ دەکەم. هەر ڕۆژێك دێ، لە شوێنێك ببینم ئێستا درەنگە درەنگە دەبێ سەر لە ڕۆژنامەکە بدەم. بەڵام هەر لەبەر خاتری تۆ ویستم شتێکی ڕەخنەیی بنووسم. [هێز وەبەرخۆی دەدات و بەڕوویێکی گرژەوە دەردەچێ].
**نیگارکێشی (X)**: - [دەگری]: کەواتە هەر چۆنێك بێ ڕای خۆت دەنووسی! بەڵام چۆن ڕاییەك! ڕەنگە زۆر بەنرخ بێ! هەرچۆنێك بێ شتێکی تازەیە. [دەست دەخاتە سەرچاوی ڕەخنەگرەکەو بەرەولای تابلۆکە پاڵی پێوە دەنێ] ئامادەبە! یەك، دوو، سێ! [دەستی هەڵدەگرێ و ڕەخنەگر چاوەکانی هەڵدەگلۆفێ و لووتی لە تابلۆکە نزیك دەکاتەوە. دوو شەقاو دەچێتە پێش و شەقاوێك دەکشێتەوە. دوو بارە چاوەکانی هەڵدەگلۆفێ و نیگارکێشی بەبێ دەنگی تەماشای دەکات].
هاا! بۆ قسە ناکەی؟
**ڕەخنەگر**: - لێ ی تێ ناگەم!
**نیگارکێشی (X)**: - لێ ی تێ ناگەی؟ جێگای سەرسوڕمانە!
**ڕەخنەگر**: - لێ ی تێ دەگەم، بەڵام...
**نیگارکێشی X)**: - ئێستا چۆنە! باشە، یاخراپە!
**ڕەخنەگر**: - [سەری لێ تێك دەچێ]: ئاخر...
**نیگارکێشی X)**: - ئاخری... چی؟
**ڕەخنەگر**: - لەشتێك دەچێ... چۆن پێت بڵێم؟ شتێك...
**نیگارکێشی X)**: - وشەکەت هەڵبێنم! دەڵێی چاك نی یە، وانی یە؟
**ڕەخنەگر**: - من چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد...
**نیگارکێشی X)**: - بەهەر حاڵ، خۆدیتت! باش دیتت! ڕاوەستە با سێ پاکە بسوورێنین. ئێستا ڕاوەستە، لەبەر ڕووناکی باشتر دەبینی. [نیگارکێشی X) سێ پاکە دەسوورێنێ و ڕووی تابلۆکە لەبینەران دەکات کە کۆمە لێك کرێکارو قوتابێ. تابلۆکەش دەسەسرێکی گەورەیەو کۆترێك لەئاوی هەڵدەفرێت. بێ دەنگی یەکی پڕ شڵەژان].
**ڕەخنەگر**: - [بەپە شیمانیەوە]: ئەو تابلۆیە دەبەیتە کوێ؟
**نیگارکێشی X)**: - دەتەوێ کێوەی ببەم؟ دەیبەمە هۆڵی پیشانگای کۆمەڵەی نیگارکێشە ئازاد یخوازەکان...
**ڕەخنەگر**: - مەبەستم ئەوە نەبوو.
**نیگارکێشی X)**: - ئا! ئا! دەمەوێ بۆیەکەم جار ئەوە بدرکێنم کە هەوڵ دەدەم ڕێزی ئەو فڵچەیەم بگرم دژ بەوانەی هەڕەشەی نەمانی لێ دەکەن ڕەخنەگرەکان ئیتر دژی هەموو ئەوانەی دەیانەوێ کۆتایی بە هەموو شتێکی بێزراو لە سەرزەوی بێنن.
**ڕەخنەگر**: [دوای کەمێ بێ دەنگی]. وادیارە بادەدەیتە وەسەر هیماخوازی؟
**نیگارکێشی X)**: - نازانم، بەڵام بەپێویستم زانی ئەوئیشە بکەم. خۆم پێ نەگیرا زۆر بێ دەنگ بم، [کەمێك وەستان] ئێستا چی یە ڕات بەرامبەر بەمن؟
**ڕەخنەگر**: - بەگرنگی دەزانی؟
**نیگارکێشی X)** بەڵێ، زۆریش.
**ڕەخنەگر**: - باپێت بڵێم تۆبابەتێکی ترسناکت هەڵبژاردووە. ڕۆژنامەکەی ئێمەش بەپێچەوانەوە مەدحی هەموو جۆرە بابەتێکی وا بەقەدەغەدا دەنێ.
**نیگارکێشی X)**: - بەڵام پێشان تۆبەردەوام بەرگریت لە بابەتەکانم دەکرد.
**ڕەخنەگر**: - بەڵام بمبورە ناتوانم بەرگری لەو بابەتەت بکەم.
**نیگارکێشی X)**: - [بەگاڵتە جاری یەوە] تەنانەت ناتوانی وەك بەرهەمێکی تەشکیلی پڕبڕواش باسی بکەیت؟
**ڕەخنەگر**: - وابزانم، نەء، چونکە...
**نیگارکێشی X)**: - ئەوە بەراستە، تەنانەت وەك نیگارکێشانیش پەسەندی ناکەی؟
**ڕەخنەگر**: - ئا! سوپاست دەکەم. ناوەڕۆکەکەی باوە.

[بەساردییەوە بەرەولای دەرگاکە شوێنی دەکەوێ، ئیتر ئیوارەت باش

**ڕەخنەگر**: ـ [لەبەر دەرگا]: وابزانم بەبێ کریار دەمێنیتەوە.

**نیگارکێشی X)**: ـ [دەرگاکە لەسەر خۆی پێوە دەوات]: خوات لەگەڵ. [کەمێك وەستان. ئینجا دەنگی تەلەفۆن دێ وپاشان ئەوقسانە دەبیسرێ]

ـ بەڵێ! چ دەڵێی، خانم؟

ـ لەبارەی تابلۆکەتەوە؟ ئا! بیربکەرەوە. . .

نازانم. . . نازانم. . . وابزانم بەدڵتە.

ـ نا، نا. . . نامەوێ ئیستا هیچ بڵێم. هەرمەبەرسە چ موعجیزەیەکە:

ـ وایە، وایە، باشە. . . باش، بەخێربێی. . . بۆ پێشانگاکەمان. سوپاس، سوپاس. [ئەلەفۆنەکە دادەنێ و بەووردی تەماشای تابلۆکە دەکات و پەردە دا دەدرێتەوە].

**پەردەی دووەم**

---

**دیمەن**: ـ هۆڵێکی بچووکی پێشانگای کۆمەڵەی نیگارکێشە ئازاد یخوازەکان. تابلۆی هەمەجۆری تێدایە لەنێو ئەو تابلۆیانەدا بەرهەمی نیگارکێشان F, C, K, B وەهی دیش هەن.

تابلۆکەی نیگارکێشی X) لە ژوورەوە بەقەد دیوارێك هەڵواسراوە. پێشانگا دەکرێتەوە. کۆمەڵێك کوروکیژ بە توندی گفت وگۆ لەسەر تابلۆکەی نیگارکێشی X) دەکەن. ژنێك دێتە ژوورێ.

**نیگارکێشی K)**: ـ [بەنارەزایی یەوە]: هەرشوورەیی یە! ئەووابکا، کۆمەڵەکەمان دا دەخرێ!

**کیژێك**: ـ گەورەم، وانی یە. وابزانم ئێرە هۆڵی نیگارکێشە ئازاد یخوازەکانە. . .

**نیگارکێشیK)**: ـ بەلام هەرچۆنێك بێ، ئەو تابلۆیە تووشی سزامان دەکات، چونکە دەریدەخات کە خاوەن چ پەیامێکین. .

**کیژەکە**: ـ تۆ؟ بۆچی؟ چەنابت لەتابلۆی خۆت بەرپرسیاریت هەقت لەهی خەڵك چی یە؟

**نیگارکێشیB)** ئێرە جێی سیاسەت نی یە. ئێرە جێی هونەرمەندانە. بێجگە لەوە جێی هیچی دیکە نی یە.

**کورەکە**: بەلام خۆئەوەی ئەو تابلەویەی دروست کردووە زیلکێش نی یە؟

**نیگارکێشیB)**: ـ منداڵ مەبە، لەگەڵ تۆم نی یە.

**کورەکە**: ـ مادام تۆ هاوار دەکەیت منیش گوێم لێتە، کەوایە مافی وەڵام دانەوەم هەیە،

**نیگارکێشیK)**: ـ جەنابت لایەنگیری ئەو دەستکردەیت. . .

**کورەکە**: ـ ئەم دەستکردەوەهی تریش. هەرشتێك حەزی لێبکەم. هەر ئەوەمان کەم بوو.

**نیگارکێشیB)**: ـ ئەوەپێشانگا نی یەوزیاتر لەمەیخانەی سەرخۆشان دەچێ.

**ژنەکە**: ـ ڕاست دەکەیت ڕێزی هونەر نەماوە. ئەوە چ هات و هاوارێکە!

**کورەکە**: ـ کەس هات و هاواری نەکردووە. بەرلە هەموو کەسێك ئەوە پیاوە دەستی پێ کرد [ئاماژە بۆنیگارکێشی (K), (B) دەکات]. ئەوی دیش دوای ئەوە.

**ژنەکە**: ـ هونەر بەکری خۆشە.

**کورەکە**: ـ بەکری و هەندێ جاریش بەهات و هاوار. ئەوە پەیوەندی بەمیزاجی مرۆڤەوە هەیە، ئەمرۆ دەمەوێ هاواربکەم. [بەدەنگێکی بەرز]، من حەز لەکۆتر دەکەم!

**ژنەکە**: ـ [دەست دەخاتە بان گوێی خۆی]: ئەوە چ هات و هاوارێکە!

**نیگارکێشی K)**: ـ ئەوە جەنابت جۆێن بەو خانمە دەدەیت لەسەرت ناچێ!

**کورەکە**: ـ تەنیا بەسەر بەستی بیروباوەری خۆم دەردەبرم.

**نیگارکێشی K)**: ـ ئەوەی کەجەنابت دەیڵێ پەیامدارێتیمان دەردەخات، هی هەمووماں! تەناتەت هی کۆمەڵەکەمان!

**کیژەکە**: ـ بەڵێ جەنابت بەخۆو بەو بارە ترسەی پەیامدارە

**نیگارکێشی K)** ــــ. . . من دەترسم؟ لەچی بترسم؟

**کیژەکە**: ـ ئەگەر نەترساپایەت نارەزاییت دەرنەدەبری. مەگەر ئەو کۆترە چی بنوێنێ؟

**نیگارکێشی K)**. ــــ ماناکەی بەلای منەوەگرنگە. باش لێی تێ بگە. بەتایبەتی ماناکەی! ئەوانی دی بکە پاشتر دێن.

**کورەکە**: [بەگاڵتەوە]: ـ ئا، ڕاست دەکەیت ئەوانی دی پاشتر دێن. چوارچێوەکەی. . وانی یە؟

**نیگارکێشی K)**: ـ [بەهەڕەشەوە]: هەی بێ حورمەت!

**کورەکە**: ـ ئەوە جەنابت شێت بوویت، چینە باشتروایە دەمت

لێك نییت . [نیگـارکێشی X) دێتــە ژ وورەوەو هۆڵـەکـەش پڕ بینەر دەبێ] .

**نیگـاکێشی B)** . ـــــ زۆر باشـە ، ئەوا پاڵـەوانەکەش هات! بابزانین چیمان بۆ روون دەکاتەوە!

**ژنــەکــە** : [لــەنیگــارکێشی X) نزیــك دەبێتــەوە بەڕێـزو پەشیمانیەوە] : ئەوە چ قوڕ بە سەری‌یەکە ، مامۆستا ، چ قوڕ بە سەری‌یەك!

**نیــگــارکـێـشـی X)** : [دەیــەوێ خۆشــەویــستـی خۆی بۆدەربخــات] : ئای خانم چیت لێ قەومــاوە؟ تابلۆی خۆت بەدڵ نی‌یە؟

**ژنـەکـە** : ـ دەبـوایـە ئاگـادارمت بکردایەوە کەوا ئەم دەستکردە لەئاستی تۆدا نی‌یە . تۆ بەو هەموو زیرەکی‌یەی خۆتەوە . . . ئەو دەستکردە زۆر . . . هەنووکە من چی لەکارەکانی ترت بکەم؟ لەتـاییـەتی چی لەو تابلۆیـەی ماڵـەوەم بکـەم کە لە سەر دیوار بۆمت کردووە؟

**نیگارکێشی X)** . ـــــ [بەگاڵتەو بێزاری‌یەوە] : بیان فرۆشە . . بیان سوتێنە ، مادام ئێستا ئەوەندە لەناوی من دەترسێی .

**ژنەکە** : ـــــ بەڵێ بەلاَم . . . . چ لەتابۆکەی سەر دیوارەکەبکەم؟

**نیگــارکێشیX)** . ـــــ بەڵێ ، خانمـەکـەم . . . . دەتـوانی بەوەستایەك بلێ‌ی دیوارەکە سپی بکات . ئەوەندە گران نی‌یە .

**ژنەکە** : ـــــ [بەگریانەوە] : هەی بەدنمەك . . . . هەی نمەك کوێر .

**نیگـارکێشی K)** . ـــــ ڕاست دەکـات . تۆ ناوی هونـەری خۆت پیس کرد .

**نیگارکێشی X)** . ـــــ زۆرم پێ خۆشە ، چونکە بەخۆم دەزانم چیم کردووە .

**نیگارکێشی B)** . ـــــ . . . . بەڵێ ، بوویتە دوژمن .

**نیــگــارکــێـشـی K)** . ـــــ ئەوە دەڵـێ‌می بووم بە دوژمـن؟ دوژمنی چی؟ تۆ . . . [لەژێر لێوانەوە جوێن دەدات] .

**نیگـارکێشی B)** . ـــــ چۆن حەزدەکـەی وابکـە ، بەلاَم من تابلۆی خۆم لە هۆڵەکە هەڵدەگرم .

**نیگــارکێشی K)** . ـــــ منیش هەرئێستــا بەزووتـرین کات هەڵیان دەگرم . هەر لەمەمان کەم بوو!

دەنگی بینەران : ـ باهەڵی بگرن! بابڕۆن!

**نیـگــارکێش X)** . ـــــ تکـایــە بێ دەنــگ بن! داوای لێ بووردنتان لێ دەکەم . نەمزانی ئەوکۆترە لەلای زۆرکەس دەبێتە بابـەتێکی ترسناك . [هەر لە ماوەیەکی] زۆر کەم **نیگارکێشی B) .(K)** تابلۆی خۆیان هەڵدەگرن وژنەکەش لەگەڵیان دەڕوا] .

**کوڕەکـە** : ـ [بـە **نیگارکێشی X)** : مامۆستا دڵگیرمەبە . پیرۆز باییت لێ دەکەن بەیۆنەی ئەوئیشەی کردووتە .

[ئینجـا هەمــوویان یەك لەدوای یەك چەپەکی لەگەڵ دا دەکەن هەرلەم دەم و دەستەدا سەرۆکی کۆمەڵەکە بە ژوور دەکەوێ] .

**نیگـارکێشی X)** : ـ سوپـاس . . . سوپاس . . . [بۆسەرۆك] چاوت لێ بوو؟

**سەرۆك** : ـ لەژووری خۆم گوێم لە هەمووشتێك بوو.

**نیگارکێشی X)** : ـ بەوەی کە سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیەی تۆ چی دەڵێ‌ی؟ بیرورات چی‌یە؟

**سەرۆك** : ـ من لایـەنی تۆدەگـرم . . . بەلاَم ئامۆژگاریم وابوو کە دەستکـردێکی وات نەهێنـابـایـە . . . بەلاَم بۆئەوەی هیـچ نەقــەومێ باهــەر تابلۆکـەت لەجێ‌ی خۆی‌بێ . لەســەرێکی دیکەوە لەو باوەڕەدانیم کە دیاردەیەکی ئاشتی‌وا گێچەڵ وئاژاوە بۆ کومـەڵـەکـەمـان . . . کۆمەڵەی نیگارکێشە ئازاد یخوازەکان بنێتەوە .

خۆ ئەگـەر واش ڕووبـدات ، ئەوە دەسـەلمێنێ کە ئێمە لەوەی ئەوان بیـری لێ دەکـەنـەوە گەورەترین ودەشزانین چۆن بەسەر بەرزی گۆی سەرکەوتن ببەینەوە .

**دەنگی لاوان** : ـ بابــژی سەرۆکی کومــەڵـەکـەمـان! بابـژی نیگارکێشی X ! بابژی ئاشتی‌و سەربەستی!

**هەموویان** : ـ [بەیەك دەنگ] : ـ هەر بژین!

[پەردە دا دەردرێتەوە]

**سەرچاوە**

رافاییل ئەلبرتی RAFAEL ALBERTI

شاعیر لە شەقام دا EL POETA EN LA CALLE

ـ شانۆ ـ TEATRO

لاپەڕە : ٩٤٥ - ٤ : PA .45-9549

چاپەمەنی [ئگیلار]AGUILAR

# چاوپێکەوتن



إلهام عبدالكريم

●پێناسەیەکی تایبەتی و ئەدەبی .

ئازاد عبدالواحد ، لەشاری هەولێر لەدایك بووە ، سەرەتا بەهەندێ هەوڵدانی شیعری سەرەتایی دەستی پێکردووە ، بەلام لەپاش ئەو هەوڵانەوە زۆر بەگەرمی دەستی داوەتە خوێندنەوە ، لەو سەردەمەدا واتە لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاوە کتێب بووەتە تەنیا هۆیێك تاکو غەمی خۆی تێدا بنێژێ . دوای ئەوە نووسینی (رەخنە)بەلای خۆیدا رایکێشاوە ، بەتایبەتیش کە دەبینین گۆرەپانی ئەدەبی کوردی پێویستی بەو لایەنە گرنگەیە . . رووکردنە رەخنەش هۆیەك بووە بۆ دەست بەردان لە شیعر ، هەرچەندە ئەو واز هێنانەی لە شیعر یەکجارەکی نەبووە ، چونکە سۆزی خۆی بەرانبەر بە شیعر بەوە پاراستووە کە رووی کردە نووسین لە بواری شیعر و شیکردنەوەو

سات وسەواکردن لەگەلیدا .

تا ئێستا چوار کتێبی چاپکراوی هەیە . کتێبی تریشی زۆرە چاوەڕوانی چاپ کردنن ، کە ئەو کتێبانە گرنگی خۆیان هەیە لەبواری رۆشنبیری ندا ، هەر لە ناوەڕاستی حەفتاوە بەشداری کردووە لە بلاوکردنەوەی لێکۆلینەوەو گووتاری رەخنەیی جۆراوجۆر و لە زۆربەی گۆڤار و رۆژنامەکاندا بلاوکرانەوە . زیاتر بایەخی لەبواری رەخنەی شیعردا گیرساوەتەوەو لەرووی تیۆری و پراکتیکی یەوە لە گرفت وکێشەکانی شیعری هاوچەرخی کوردی دواوە . هەر بۆیەش بەپێویستمان زانی دەربارەی بارودۆخی رەخنە رۆشنبیری کوردی شیعر و نوێخوازی لەگەلیدا بکەوینە دەمەتەقێ .

● پ

ئایا هیچ سیماو ئادگارێکی رەخنەی ئەدەبی کوردی دەبینی کە ئەدیبەکان پشت گوێیان خستبێ و باسیان نەکردبێ . . ؟

● بەلای منەوە هەموو داهێنانێکی راستەقینە لەوسەر دەبێتە گوزارشت کردنێکی راستگۆیانە لەواقیعێکی دیاری کراو ، ئەو داهێنانە پەیوەندیی بەو واقیعەوە دەبەستێ و کاری تێدەکات ، چونکە هیچ کارێکی داهێنەرانە نی یە بێ لایەن بێت بەلکو گوزارشت لە جیهان ـ بینی یەکی دیادیکراو دەکات و داکۆکی لێ دەکات ، لە هەمان کاتیشدا تەرخانی دەکات بۆ خزمەتی مەسەلەیێکی دیاریکراو . هەر لەو پێوەدانگەوە من لە لای خۆمەوە هەوڵم داوە (رەخنە)بکەمە چالاکیەك بۆ دەرهێنانی ئەو دەلالەتانەی لە ناو قووڵایی داهێنان خۆیان حەشار داوە ، بۆیە دەپرسم ودەلێم : ئەوەی خوێندمەوە لێ زیادکردن و تێپەڕاندنە . . یان دەملاسکەو جوینەوەیە . . ؟ ئایا هەوڵ دەدات واقیع بگۆرێ یان دەبێتە بەشێك لەواقیعەکە . . ؟ ئەوانە ئەو پرسیارانەن کەوا جیهانی ئیبستمولۆژی و کەرەستەی رەخنەیی من ئاوەدان دەکەنەوە ، کەوێستوومە داهێنان ـ بە هەموو جوولەو بزاوت وگۆرانکارییەکی یەوە ـ بگرم .

لە ئەنجامی خوێندنەوەی خۆمەوە بۆم دەرکەوتووە لەناو بونیادی رۆشنبیری کوردیدا دوو جەمسەر هەیەو کەوتوونەتە زۆران گرتن ، شێوەیەك هەیە حەز بە خولقاندن دەکات ، بەلام بە شێوازێکی تەقلیدیوکۆن بەمەش ناسنامەو کەسایەتی و بنەمایەکانی خۆی لەبیر دەچێ شێوەیێکی دیکەش هەیە هەوڵ دەدات هوشیارییەکی نوێ دابمەزرێنێ کە بە رەخنەگرتن لە خود دەست پێدەکات بۆ ئەوەی سەر لەنوێ دایرێژێتەوەو

پەیوەندیی نێوان (خود)و(ئەوان ـ واتە رۆژئاوا)بدۆزێتەوە نە پێناوی دانانی هەڵ و مەرجێکی مەوزوعیانە بۆ ئەو پەیوەندی‌یەی کەبە (ئەوان)ەوە دەمانبەستێتەوە ئەوەش دەتوانین ناو بنێین هوشیاری دژایەتی کردن کە لەسەر رەخنەی دژایەتی کردن دامەزراوە تاکوشتە ئاشناکان تێپەڕێنێ بۆ دامەزران و هێنانە کایەوە بەرهەمی تایبەتمەندو جیاواز. هەوڵیش دەدەم لە نووسینە رەخنەیی یەکانی داهاتوومدا زیاتر سووربوونی خۆم لەسەر (ئیپستمۆلۆژیا)بەدیار بخەم کەنیشان دانی رۆڵی مەعریفەتە لە داهێنانی ئەدەبیدا چونکە لەو سەردەمەدا ناتوانم نوسەرێکی داهێنەر بهێنمە بەرچاوم ـ لە هەر بوارێکدا بێت ـ ئەگەر خاوەنی رۆشنبیری‌یەکی فراوان و هەمە لایەن و گەورەنەبێ. بڕواشم بە شاعیرێك یان ئەدیبێك نی‌یە بە عەفەوییەت بنووسێ. چونکە شاعیر لەو چاخەدا لەپەنای خودی خۆیەوە گوزارشت لەچاخ و سەردەمەکەی خۆشی دەکات. بۆیە پێویستە هوشیاری شیعری لەسەختمانی شیعردا رەنگ بداتەوە. ئەوانەش کە باسی لاوازی رۆڵی (رەخنە) دەکەن بەمە نابنە داهێنەرو جڵەوی داهێنان ناگرنە دەست چونکە رەخنەی کوردی هەیەو قەبارەی بوونەکەیشی هیچی لە بوونی (داهێنان) کەمتر نی‌یە سرینەوەی رۆڵی کاریگەری رەخنەو سەرکوتانەوەو نەرەخسانی دەرفەتی گونجاو بۆی، بگرە چوون بە گژیدا بە هەموو چەکێك و شێوەو رێگایەك لەپێش هەموشتێکەوە زیان بە داهێنانی کوردی دەگەیەنێ کەسیش لەرەخنەگر شایان تر نی‌یە بۆ دەست نیشان کردن وناسین و جیاکردنەوەی قەڵەو لە لاواز، یا دەست نیشان کردنی نرخ و بەهای داهێنان بگرێتە ئەستۆی خۆی، چونکە رەخنە رووی دووەمی کاری هونەری‌یەو وا لە داهێنەر دەکات هەست بە نرخی خۆی و داهێنانەکەی بکات، پاشانیش هەڵەوکەم و کوری‌یەکانی کارەکە دیاریکات.

●ئایا ئەو قسانەت ئەوە دەگەیەنێ کەتۆ لە واقیعی رەخنەی کوردی رازی بیت..؟

● بێگومان نەء.. من باسی واقیعم کرد، واقیعیش لە خەون و ئاوات جیاوازە.

تۆ تەماشاکە بۆشایی شیعر کە رەخنەگرە ئەوروپی‌یەکان چەندی بڵێی لەسەریان نووسیوە، کەچی ئەو کێشەیە لەلای ئێمە تاکو ئەمرۆ پەنهان و تاریکە. جیهانێکی سەرسوڕهێنەرو ناسك و وردە لەسەر ئاستی ئیپستمۆلۆژی، واتە لەسەر ئاستی شیعریانەی داهێنان وەکو دەقێکی زمانەوانی خەون قەوارەیێکی هەست پێکراو لە ناو بۆشایی ئەو دەقەدا مەخلوقاتی بێ ژمارە لەو قەوارەیەدا یەك دەگرن و لێك جیا دەبنەوەو یەکسان دەبن، ئەو جیهانە بەگرتووە لە جیا جیایی دا هەرمەك جیا جیا [illegible]

ناو ... بەرنامەیەو بە ئاسایش هەڵبژێردی بە ... واقیعی ... کوردی من سوورم لەسەرخستنە رووی لایەنی تیۆری رەخنەدا، بۆئەوەی چەمکە رەخنەیی‌یە هاوچەرخەکان بە ئەدەبەکەمان ئاشنا بکەین وباسی رێبازو رێرەوە نوێ‌یەکانی نووسینی ئەمرۆکە بکەین و بەهۆی ئەو رێبازە تیۆری‌یەوە کێشەکانمان یەکالا بکەینەوە ئەوانەش کێشەی زاراوە سازی و نوێخوازی و کەلوپوورو زمان و خوێنەر وتاد. لەم بوارەشدا سوود لە تاقیکردنەوەو ئەزموونی ئەو میللەتانە وەربگرین کە بەرلە ئێمە لەو بوارانەدا نووسیویانە ئەمەش بەلای منەوە بە هیچ شێوەیێك بەکەم و کورتی ناژمێردرێ. چونکە ئێمە لە سەرەتای رێگادایین و خەریکی خۆکۆکردنەوەو خۆدروست کردنین، سەرباری ئەوەی ئێمە میللە تێکین کەرەخنەمان کەلوپورێکی دێرینەی نی‌یە تاکو پشتی پێ ببەستین و لەوێرا دەست پێبکەت بۆیە من پەنا بردنی رەخنەگر کورد بۆ هەندێ (بەرنامە)بەشتێکی چاك دەزانم و

قەت ئەوە لاسایی کردنەوە نی یە ـ لێرەدا مەبەستم گوێزانەوەی میکانیکیانە نیە ـ بەڵکو مەبەستم چوێنەتی دۆزینەوەی ئەو کلیلانەیە کە بە هۆیانەوە بتوانین دەرگایەکان بکەینەوە و بەریگای تایبەتی خۆمان سۆراخ و پرسیار بکەین و بەپێی بارو دۆخی رۆشنبیری خۆمان دەست نیشانی هەموو نوێ‌یەك بکەین.

**●چۆن تەماشای کێشەی نوێخوازی دەکەی. . ؟**

ـ لەپاش ئەوەی ئەمرۆکە (ساختمان سازی ـ البنيويه) دەستی خستە هەموو بوارەکانی ژیان لەوانە جل و بەرگ وچێشت لێنان و . و . . ولەپاش ئەوەی (نوێخوازی) لەزۆر زانستگەی جیهاندا کورسی پێدراو وەکو دەرز دەخوێنرێ و ئێستاکە باس لە باسی (پاش نوێخوازی ـ مابعد الحداثة) دەکرێ ئنجا لەلای ئێمە (نوێخوازی)بەم دوا دوایی یە قسەی لێ کراو مشت و مری بەرپا کرد، بەڵام چۆن قسە لێ کردنێك وچۆن باس کردنێك . . ؟! ئەمەیان هەڵدەگرم بۆ دەرفەتێکی دی.

بەهەرحاڵ من لەگەڵ ئەو کەسانەدا یەکدەگرمەوە کەوا (نوێخوازی)دەکەنە ئاسۆیەك بۆ ئەزموون و هوشیاری خۆیان لەگەڵ ئەو شاعیرانەدا نیم کەوا تێکستەکانیان فرێ دەدەنەناو غوربەتێکی نقوم بووی غوربەتەکەی خۆیان دەنا شاعیر ناتوانێ (شاد)لەسەر (باو)دامەزرێنێ ، شاعیری نوێخواز لە پێودانگی جیاوازی و خستنە سەر ، لەگەڵ رابوردو بەردەوام دەبێ ، بەمەش ئامادەبووی سەرنج راکێشەرانەی خۆی دەسەپێنێ و لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆی لە (جیاوازی)دا یەکدەگرێتەوە وەو دەچێتە ناو گۆرانگاریەکانی چاخی شیعرەوە تاکو گۆرانی قۆناغەکان بروات و ئەوسەرەتا جیاوازە بۆخۆی دامەزرێنێ . نوێخوازی پەیوەندیی بە کاتەوە نی یە ، خوێنەر کاتێك لەبەر رۆشنایی رۆشنبیری هاوچەرخانەی خۆی شیعری گەورەی شاعیرانی کلاسی کوردی‌ی دەخوێنێتەوە ئەو کاتە دەبینێ شانازی بە زۆر لە شیعر و وێنە شیعری‌یان دەکات و وەك بڵێی ئێستاکە نووسرابن لێرەو دەتوانین بڵێین نوێخوازی یەکەیان لە دەرەوەی کاتەوەیە ، چونکە چەمکی نوێخوازی لای من شان بە شانی چەمکی کەینونەت ناوەستێ بۆیەکە داهێنانی هونەری کاتی خۆی سەلماند ئەوە بەمانای کەینونەتی خۆی سەلماند، تێکستی داهێنەرانە کە پیر نابێ وکۆن بوونی بۆنی‌یە هەمیشە لە دەرەوەی مێژ ووە واتە داهێنانی ئەدەبی و هونەری لە دەرەوەی کاتدا دەژیت بەڵام نەك بەو بابەتەی دەیخاتە روو بەڵکو بە ساختمانەکەی خۆی چونکە ئەدەب بابەت نی یە بەڵکو رێك خستنی بابەتە نوێخواز سەرپێچی دەکات، بەڵام سەرپێچی یەکەی لەسەر دەستووری ئەو سەرپێچی کردنە نی یە کە لەپێناوی ناو دەرکردن وناسران دەکرێت، بەڵکو لەسەر شێوەی بە هوشیارییەوە سەرپێچی بکە تاکو بە هوشیاری‌یەوە تایبەتمەند بیت . لێرەوە من ئەوە رەت دەکەمەوە شیعر جەستەیێکی سڕ و مردوو بێت چونکە شیعر دروست کردنی چەند قەوارێکی نوێ‌یە، حاڵەتی داهێنان بیری سەقامگیر بوون و وەستان بە خۆیەوە ناگرێ جوانی وگەورەیی شیعریش گۆران بەرپا کردنە لە شێوەدا بەڵێ زۆریان دەربارەی نوێخوازی گووت هەندێ نوێخوازیان بە هەڵگەرانەوە دانا هەندێ گوتیان دەمێکە وەختی بەسەرچووە ، بەڵام من لەو براوایەدام هەموو شیعرێکی گەورە جوان ئاسۆی نوێخوازی خۆی هەیە بۆیە نوێخوازی جیهان بینی‌یەکی تایبەتی بەرانبەر بە جیهان شیعر هەڵوێستی شیعر بە بەرانبەر بەژیان و گەردوون بە شێوەیێکی گشتی نوێخوازی مانای تەغریب

ناگەیەنێ ، یان مەبەست لە داخراوی نی یە بەڵکو بەردەوام بوونێکی راستەقینەیە لە نێوان ئەو ئەرکە شارستانی‌یەی شاعیر لە ئەستۆی دەگرێ لەگەڵ واقیعی ژیانی رۆژانە ، لە وەوە بنەمای رەسەنایەتی دەسەلمێنێ و تونستی ئەوەی دەبێت بەردەوام بێ و بە بەردەوامی نوێ بێتەوە . نوێخوازی پەنا بردن نی یە بۆ نووسینی شیعرێکی تەمومژاوی و بە دەستی ئەنقەست روو بکاتە شیعری قورس بۆ تێگەیشتنی و دابرن لە خوێنەر بکاتە مەرجی نوێخوازی چونکە ئەوەیان بەلای منەوە ئەنجامی بێ دەسەلاتی یە لەو لاشەوە یەك نوێخوازی نی یە، ربەڵکو کۆمەڵی نوێخوازی هەیە ، بەرلە هەموویان لە عەقڵدا دەست پێدەکات ، پاشان لە جیهان بینی و هەموو بوارەکانی ژیان ئنجا لە شێوەو ساختمان و پێکهاتندا نوێخوازی دەست پێدەکات ، نەك هەموو ئەو لایەنە گرنگانە بخرێتە ئەو لاوە وبڵێین نوێخوازیمان بریتی‌یە لە تێکشکاندنی شێوەی قەسیدە بۆیە نوێخوازی جیهان بینی و ریسلێکی فەلسەفینانەیە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە شاعیری نوێخواز بە دوای ئیقاعوکاندا دەگەرێ وپاشان لە ناو زمانە تایبەتی‌یەکەی خۆیدا بە دوای وشەکانی ئەو ئیقاعەدا دەگەرێت . بیگومان شاعیری نوێخواز مومارەسەی

سەربـــەستـی خۆی دەکـــات بە ئیـــەتی سەرکێشی کـــردن و دۆزینـــەوەی نادیـار (ئەو نادیارەی کە هەمیشەوهەردەم پێویستی بەدۆزینـەوەیـە) ، جگە لەوەی بەر پرسیارییەکی تاکە کەسی یەو لەنـاو (خـود)داداهێنـان دەتـەقێنێتـەوە ومـروڤـایـەتی داهێنـەر دەســەلمێنی،کە ئەویش خودی خۆی نادۆزێتـەوە تەنیـا لە پاڵ سەربـــە ستیـدا نەبێت . هیـچ جۆرە دەست لە دەست نان و ئاشت بوونـەوە پێکیش لە ناونـوێخوازیدا نی یە ، چونکە ئەگەر هەبـوو دەبێتـە سوار بوونی کۆڵی نوێخوازی ، بەتایبەتی ئەگەر ئاشت بوونـەوەو تەسلیم بوون بوو بەرابـوردوو ، چـونکە رزگار بوون لەمێـژ ووو لە رابـردوو نایـەتـە دی بەبێ ئەوەی بیکـەینـە بەشێك لە خۆمان و تەواوەتی تێی بگەین ،

**●ئەی هەڵوێستی نوێخوازی بەرانبەر بە کەلوپوور چی‌یە . . ؟**

- من وای دەبینم کە کێشـەی کەلـوپـوور یەکێکـە لەو کێشـە بنەرەتیانەی کە رووبە رووی نوێخوازی دەبێتەوە بەڵکو یەکێکە لەو مەسـەلـە خەتـەرنـاکـانـەی کەوا پێـویستـە بە تێـروانینێکی رەخنـەیی یـەوە تێی بروانین مەبـەستیش لەوە دابر بوون نی یەلە رابوردوو، بە ئەوەی داواڵە شاعیرو داهێنەر دەکەین کە هەردوو لایـان بەعـەقڵێکی رەخنـەیی ساغلەمـەوە رابوردوو بخوێننەوە نابێ ئـەوشـمـان لەبیـر بچێ کە کەلـوپوور حالە تێکی یەك گرتو نی یـە بەڵکـو بریتی یە لە چەند ئاستێ ، ناکرێ هەموورابوردوو لەیـەك باردا کۆ بکـاتـەوەو بە یەکـســانـی هەمـوو رەمـزەرۆشنبیـری یـەکـان لەتـەك یەك دابنێ چونکە کێشـەی پەیوەندی شاعیری نوێ بەکەلوپوورەوە کێشەیەکی مەعریفی یە کەرەخنـە لەلای ئێمـە تا ئێستـا بە تێـرو تەسـەلی لەو کێشـەیـە نەدواوە بۆئەوەی جۆری ئەو کارتێکـردنـە دەست نیشان بکات کە دەبێتـە بنـەرەت و بنچینـەی نوێخـوازی واتـە نەمـانتـوانیوە کێشـەی نوێخـوازی وکـەلـوپـوور بە تێروتەسەلی لێی بدوێین هۆی سەرەکـی باس نە کردنی ئەو کێشـەیـەش ئەوەیـە کـە رۆشنبیـری کورد ئەوچەکـە مەعریفی یەی نی یە تاکو باسی ئەو مەسـەلـە خەتـەرو ناسکـانـە بکـات بۆیـە کردەی رووبـە رووبـوونـەوەی زات و بەراوردکـردنی بەوان (الآخـر)وسـوود وەرگـرتن لێی لەوەوە دەست پێدەکات کە هەوڵ بدەین خودی خۆمان تێپە ڕێنین و لە پلە یێکی نزمی کاتێکی عەقلی یەوە بەرەو پلەیێکی بەرز وبڵنـد /بیگـوێـزینـەوە/ . کەوابێ رووبە روو بوونـەوەی (ئـەوان) زانـیـن ودەست نیشـان کردنی ئەوەی بەدەستیـان هێنـاوە تەنیا ڕێگایەکە بۆ ئەوەی بارودۆخی ئێستای رۆشنبیـری کوردی تێپـەڕێنین کە خەریکـە سەلـە فی یـەکـان غەزەل وستـایش بە شان و باهووی دەستکەوتە وەهمی یەکانی دادەڵێن،گرنگ ترین شت لە هونەردا گەرانە بە دوای خود ،

**●هـەرکاتێ شاعیر بەدوای خودی خۆیدا نەگەرا ئەوکاتە دەبێتە شاعیرێکی ئاسایی و تایبەتمەندی**

خۆی نابێ ودەستی ناکەوێ چونکە شاعیرێکە نە نیگەرانی و نە پرسیـار لەلای خوێنەر ناوروژێنی نوێخوازی راستە قینەش ئەو کەسـەیە لەگەڵ مەنیتقی ژیان دەروا بەرێوە ، مەنیتقی ژیانیش هەموو مەنتیقی رەت دەکاتەوە . .

**● ڕێبازە رەخنەیی یە باوەکانی و کوردی کامانەن . . ؟**

- هەر چەنـدە لەوبروایـە دا نیم کەوا ڕێبـازێکی رەخنـەیی وا هەبێ رەگی داکوتا بێ و دروست بوو بێ لە ناو ئەدەبی کوردیدا ، بەلام من لەورایـە دام کە رەخـنـەی کوردی ئەمـرۆکـە پێـویستی یـەکی زۆری بە هێنـانـە کایەوەی زمانێکی رەخنەیی نوێ هەیـە ، بۆئەمـەش پێـویستـە سوود لە ڕێبـازە رەخنـەیی هاوچەرخەکان وەرگرێ لەپاش ئەوەی لە مرۆکەدا ئەمسـەرو ئەو سەری دنیـا لێکی داوەو لە یەکتـر نزیـك بوونەتەوە لە ئەنجامی ئەو پێـشـکـەوتـنـە خێـراو بەردەوامـەی کە لە بوارەکـانـی (گـوێـزانەوە)و(راگەیاندن)دا بەرپا بووە . ئەمەش بووەتە هۆی گوێـزانـەوەی خەڵکی لە شوێنـەکـەوە بۆ شوێنێك بە ئاسانی و فرێنی هەواڵ و رووداوە کان بەخێـرایی تاکـو بە دەوری هەمـوو جیهـانـدا بخـولێتـەوە . هەروەك چۆن کۆمـەڵگـای مرۆڤایەتی ئەمـرۆکـە لەنـاو کەش و هەوای شارستـانی یـەتێکی کەونیـدا دەژی، کەدەبینین هەموو داب و نەریت و بیروراو فیکرو چێژ و چەمکـەکـان لەلای هەموو میللەتاندا بەیەکداچوون و ئەمرۆکە خەریکـە هەمـوو جیهـان دەبێتـە یەك کۆمـەڵگـا ، هـە چەنـدە جیـاوازی گەورەو قووڵ تا ئەمـرۆکـەش لەنیـوزۆربەی نەتەوەو گەلـەکـانـدا هەر ماوە ، میللـەتی ئێمـە لەوبـارو دۆخـە نابێ بەدووربێت وگۆشەگیرو دەستەوئەژنۆ دۆش داماو بوەستێ .

شەخـسی خۆم لە نووسینـەکـانـمـدا مەیـلم بەرەو لای ئایـدیـۆلـۆژ یـەتی داهێنـان ودەق دەروات ، هەر چەندە لەولا رێـرەوێکی ئایـدیـۆلۆژی رووت لەگۆرەپانی رەخنەی کوردیدا باوە لەپـاڵ هەنـدێ نووسین کە دەربـارەی ڕاست کردنـەوەی هەڵەی زمانەوانی دەنووسرێن .



# پایز

● کامیل ژیر ●

خۆر ئاوا بوو پایزی خەم سەرپۆشیکی زەردی پۆشی
خۆر ئاوا بوو کوڕو کاڵان بادەی خەفەتیان ئەنۆشی
هەوڵدانی بەردەوامی ئەو ڕۆژەیان ، وەکو ڕۆژان
نەیگرتە خۆی باوەشی فەڕ نەیگرتە خۆی کۆشی وچان
ئەو شەوەیان هەتا بەیان بە بێ ئارام، بە بێ وەنەوز
چاوی خەمیان لە درەخت و لە بیستان و لە باخی سەوز
کە بەیانی سپیدەیەك بە هێمنی دای لە کەژان
کوڕو کاڵان ڕەویان کردو گەلاویژی گەشیان هەژان
ئەو ئەستێرە خان و مانەی بووکی ئاسۆ لەو بەرزەوە
دڵی، ڕەنجا دوویان کەوت و بەو هەژێن و بەو لەرزەوە
لەگەڵ ڕەوی کوڕو کاڵان ون بوو لە چاو، بەری ئاسمان
ڕەش داگیرسا، هەورێکی چڕ دایە ناڵە، دایە گریان
بەزریانی پایزی خەم گەڵاوەری، سەوزی نەما
پەپوو بەستەی مەرگە ساتی تێ چریکان، کەوتە سەما
کوڕو کاڵان بەو داخەوە گەڕانەوە بۆ پەپووی شەڕ
بۆ جووت و تۆو داوەشاندن بە ڕۆژانی پایزی تەڕ



# دارە وشکێکم

ئەمین نەقشبەندی

بەغدا ١١/١١/١٩٨٩

داری ژینم وشکی دوریتانه بۆیە ناچەمێ
دارە وشکێکه. ئیتر. نەیماوه بارو بەرهەمێ

■■■

شینی دیدەم گیانەکەم خۆشینی کردوه ئەوچەمه
چونکه بۆ هەر هاتوچونێ لێی دەبارێنم نمێ.

■■■

گەرچی جەستەم شوێنەمایکی نەماوه وەك تەمه
لەو تەمەش هەر بەربەیانێکی دەرێژم لێزەمێ

■■■

گیانه دوری ئێوه سوتاندویه ریشەی جەرگ ودڵ
بێت و گەرمابێ، چەمێکه [1]، یاتەمێکه، یاخەمێ.

■■■

هەر وەکو پەروانه سوتاوه پەروباڵ و لەشم
خۆم بەلاگەردانه کەم دایم لەبۆ باڵای شەمێ

■■■

هەرکەسێ نەی چەشتبێ، زوخاوی دووری، کەی دەبێ
بێتە ریزی خێلی غەمخوارو دەبێتەهاودەمێ؟،

■■■

[رۆڵه باورکەن، لەدوری دیمەنی یارو دیار
نیوه مەرگێکه ژیانم هەردەمێکم ماتەمێ

■■■

هەرچی دەبینم سبەینان شەونمی ناوکۆشی گوڵ
ئەو دەمانەم دینەیادم دەم دەهاته سەردەمێ

■■■

شەونم و بولبول، پەپولەو هەنگی ئەو باخ و چەمه
خۆزگەیان پێبێ کە هەرماون لە نێو باخ و چەمێ

■■■

من کەناکامی عەزیزان و چەم و باخ و گوڵم
کێ گیان و رۆحی پێویستە بەفلسێ بیدمێ

■■■

سەردەمێ لوطفی خودابو پێکەوەی کۆکردبوین
هەردەمێ ئاواته خوازی ئەودەمانەم [2] هەردەمێ،

■■■

ژانه، دەرده، زام و ئێشه ژینی من
ساخودا دەرمانێ، چارێ، حاڵ زانێ، مەڵهەمێ.

١ چەم: لێرەدا مەبەست چاوه.. بە هەورامی بەچاو دەڵێن «چەم»

٢ ـ دەمانه.. هەم لەخەطەو هەم دەم ولێو

# هۆنراوەی داهێنان

● محمەد بەدری ●



لە کۆنگرەی
داهێنان و نەمری‌دا
خواوەندەکانی هونەرو بەهێزی‌دا
خەلاتی ژین و مانەوە
بۆ هۆنراوەی داهێنانیان
دەستنیشان کرد
ئەوساکە لافاوی هەڵبەست
دەستی پێ کرد
شەپۆلی هۆنراوەی بە کێش
پڕ لە جیناس و ڕەوانبێژی
بە تام و چێژ
هۆنراوەی پەخشان و سەربەست
بوو بە هەرا
جێگە هەمووی بوو بە هەڵبەست
کێ بردیەوە
شیعری بەکێش نەخێر نەخێر
شیعری سەربەست نەخێر نەخێر
ئایا پەخشان بردی‌یەوە نەخێر نەخێر
ئەزانن کێ
خەلاتی شیعرو داهێنانی بردەوە
کچە جوانێکی هەرزەکار
لە شاری زەبوونی نەبەرد
داگیرکەر ڕاو ئەنا بە بەرد
وتیان.. بیروڕای هەموانە
ئەمە شیعرەو داهێنانە.



# پێنج خشتەکیەکی بڵاونەکراوەی جاهید لەسەر شیعری صابیری لەساڵی ١٩٦٤ دا کردویەتی پێنجین لەپێش ٢٥ ساڵ

وەفای یارێکی دڵسۆزم بەیەك دو مەرحەبا نادەم
نەخوش بوم گەر بپرسی لێم بە دەرمانو شیفا نادەم
جەفای گەر نەبڕێ لێم یارم بە هیچ خۆشیو سەفا نادەم
کڵاوی سەر دڕاوی خۆم بە تاجی پادشا نادەم
کە لاوەی دوکەڵاوی خۆم بە قەیرو گەنجی شا نادەم

کە خۆم سەر لەشکری یار بم بە من چی روتبەوو قایش
لە دەورەم خیوەتی غەم هەڵکرا بێ تیب و ئالایش
دلم ناچێ لەبۆی دەستم کەوێ دەوڵەت بە خۆرایش
پلاوی سەر بە کشمیشی فەقیری یەعنی ئاسایش
خودا بیدا لەمەولا رو بە ترشیو شۆربا نادەم

بلێن پەو شۆخە ئەم پەردەی لەسەر روچاکە نەدرێنێ
وەلامی شادیو خۆشی ئەگەر پێماوە بۆم بێنێ
ئەوا هاتم حیسابێکی لەگەل من مابێ بیستێنێ
کەلاوی خۆم بەدەستی خۆی گوڵاوم لێ بپەرژێنێ
ئیتر حاشاوکەڵا دەس لە داوێنی سەبا نادەم

لە دەس خۆت بۆ ئەدەی من هەر زەمانی جیگەو رێتم
لە یادم هەر ئەمینی هەر وەخت من هەر تەما پێتم
ئەگەر تۆ نانی تەندوری منیش هێوین و هەم خوێتم
بەخوینی جیفە بەرگی زاهیدی ئالودەکەم شێتم
بە تەوفیقی خودا دینم بە دو نان و عەبا نادەم

لە ریگەی عەشق و سەودایی نەنالینیو ئەگەر نەگرێ
لە بۆ تەحقیق ی ئامالت نەدەی هەلمەت لەبوی نەمرێ
عەزابو ئەزیەت ومیحنەت لە [جاهید] توزی وەرنەگرێ
کلیلی [صابیری] قاپی هەموو مەقسودی هەل دەگری
محمد الله بە دەس گرتومە رەنجی خۆم بە با نادەم

لاوی هونەرمەندو وینەکیش کاك ئاشتی مەهدی کە چاوی کەوتە هەلبەستەکەو خوێندیەوە ئەم ئابلۆیەی وینەکیشا زۆر سوپاسی ئەکەین.

● حسین بەرزنجی ●

# بەهارە

● کەوکەوب مەوراسلتی ●



بەهارە
وەرزی گوڵ و
گوڵزارە.
وەختی چرو
کردنی دارە
رەوینەری خەمو
پەژارە
بەهارە.
چەژنی کێو
نسارە
هەموو شوێنێ
خۆشی دیارە
هەر یارەو دەست
لەمل یارە
تیمار کردنی دڵی
زامدارە
هەر بولبولە لەسەر
چڵە
خامۆش و شەیدای
گوڵە.
بە هەزار بەزم
ئەخوێنێ
دڵی ئاشقان
ئەهەژێنێ
یاوردە نمی
بارانی

پیرو گەنج ئەخاتە
گۆرانی
نەرگسی نەرگسە
جارە
لەسەر دوکان و
بازارە
وەستاون لاو
بە هەستەوە
چەپکە نەرگس
بە دەستەوە
پاك و خاوێن و بە
چۆشن
چەپکە نەرگس
ئەفرۆشن.
یاسەیری ئەوکەژ و
کێوە.
بزەی پێکە نینیان لە
سەر لێوە.
هەڵاڵە برەمی چاو
رەش
سورە هەڵاڵەی
جوان و گەش
بەرە زاولۆو کورپە
چنور
گاو گۆڵاڵ و گوڵاڵەی
سوور

دەر هاتوە قارچکی
چاو بەڵەك
کردیویانە بە رەش
بەڵەك
توانەوەی بەفر وەك
بلور
ئاو دێتە خوار هەر
وەك کافور.
رازاوە ئەو دەرو
دەشتە
پاك کراوەی دوای
وەشتە
هەر ئەڵێی پارچەی
بەهەشتە
رۆژ رۆژی سەیران و
گەشتە.
باعە باعی مەرەکانە
•
شمشاڵ بەدەست
کاکەی شوانە •
پۆلە کچی ناسك و
جوان
بەرێوەن ئەچن بۆ
ناو ران.
لە دواوە دەستەی
هەرزەکار

لاوی باڵا بەرزو
نازدار.
بە دەستیانەوە گوڵی
سوور
شوێنیان ئەکەون نزیك و
دوور
هەتاکو ئەگەنە ناو
ران
ئەکرێ بە هەڵ پەرکێ و
سەیران
شمشاڵ ئێدە کاکەی
شوان
بادەست بگرن کوڕو
کچان
ئای کە خۆشە ئەو
سەیرانە
لەسەر ئەو شاخ و ناو
رانە
خۆزگە هەمیشە بەهار
ئەبوو.
بزەی پێکەنین دیار
ئەبوو.

# لەسەر ڕەوتی سوارچاکانی شیعر

## پێنج خشتەکی «فاتیحی» لەسەر غەزەلێکی «عوسمان وەهباخی»

● مەلا عبدالرحمن فاتیحی ●

سەنگە سەر ● شووباتی/١٩٨٨

ئەو عیشوەوو نیم نازە هەمو پیشەیی زووتە
ئەو چاوو برۆیەت هەموو نەخشی جەبەڕووتە
ئەو داوە چ داوێکە لە نێو حەڵقەیی مووتە
«ئەو خاڵە چ خاڵێکە لەسەر کە عبەیی ڕووتە
ئەو جامە چ جامێکە لەسەر زاری سەبووتە»

●●●

گیان بەخشە گوڵم، خاڵ و خەت و دووبەیی و سێوت
بۆنت کە دەکەم چوونکە ئەتۆ خونچەیە نێوت
مەفرۆشە بەمن چیدی قسەی تاڵ و جنێوت
«ساڵێکە بە ڕۆژووم بە تەمای بۆسەیی لێوت ئەو ماچە چ ماچێکە لە بۆمن وەکو قووتە»

●●●

گرتوومەتە بەر کێوو کەژو دۆڵ و بیابان
لەو چۆڵ و چڕ و شاخە سەرا سیمەو حەیران
بێزا لەمن خەڵکی لەبەر شیوەن و گریان
«ئاوارەیی تۆمە دەگەڕێم پەرت و پەرێشان
ئەو ڕێیە چ ڕێگایە تەلان و هەڵە مووتە»

●●●

ڕێگەم بدە قوربان کە بکەم سەیری جەماڵت
بەینێکە منم سائیلی بەردەرکەوو ماڵت
فەرمووتە کە هاتم بیمە سێبەری خاڵت
«دیسان بەجەفا چوو، سەنەما!! وەعدی ویساڵت
ئەو جەورو جەفایە عەجەبا عادەت و خووتە»!!

●●●

تێکەڵ بووە لەو باخە لە ئەنواعی شەقایق
نەم دیوە لەئەو جوانترو مەحبوبترو لایق
سەر دەستەیی شۆخانە گوڵم لایق و فایق
«وەك ڕەوزەی ڕیزوانە موو قابیل بە حەدایق،
ئەو باخە چ باخێکە بەری سێوو هەڵووتە»

●●●

من بولبولی خۆشخوانی گوڵی باخی بەهارم
مەجنونی دوو چاوی ڕەش و دوو سێوو هەنارم
هەر ناڵەوو ڕۆ ڕۆمە ئەوەند مەست و خوو مارم
«هەر گونگەڵ و غەو غایە لەلای گوڵشەنی یارم
دابزانە چ قەوماوە، گوڵی لێ تە قووجووتە»

●●●

ئەو وەختە دڵم شادە کە گوڵ بێتە عەیادەت
بۆ عاشقی بێ چارە بکا جارێ ئیشارەت
ئەو زوڵمە لەسەر «فاتیحی» بۆ دەیکەیە عادەت
«حاشامەکە لێمان ئەوە بردوتە بە غارەت
نەقدی دڵی «عوسمان» کە لە نێو بەندی قدووتە»

●●●

# مەرگی چوار وەرزی ساڵ



● ئازاد عبدالواحد كريم ●

- ١ -

دەنگە هەڵبڕە . . .

ئەی ئەو کەسەی کە شەو دادێ

ئەمخەیتە نێو بازنەی خەم و

ئەمسووڕێنیت و لوول ئەخۆم

خۆ هەر منم بەرگەی خەمی دووریت ئەگرم

مۆتەکەیەك بەسەر دڵما

هەنگاو ئەنێ و شێتم ئەکات

ئەی چۆن شێت و بێ گیان نەبم

خەمی خۆم و هی تۆش ئەخۆم

- ٢ -

گەر ئەمزانی کەی ئەمردم

دەمم ئەنا بە گوێتەوەو . . .

لەگەڵ خۆما ئەتمگریاند

بەو گریانە لافاوێکمان پێك ئەهێنا

ئەوجا . . . دایە

یانەی ئاوەدان وێران ئەکردم[1]

- ٣ -

بەئەسپایی، هەموو ساتێك

بە پێ دزە لەژوور سەرت دائەنیشم

قەت ناهێڵم . . .

بە تەنیایی ئاخ هەڵکێشی

بۆنی قژو چاوت ئەکەم

تێرتێر ئەگریم

ئەبم بە مۆم ! !

هەرچەند بۆنی هەناسەکەت بەرم کەوێت

گڕ ئەگرم و دائەگیرسێم

دە پێم بڵێ وا شەقم برد

کە من وابم دڵم نەیەت جێت بهێڵم

یا لەو خەوە قووڵەت بکەم

ئەی بۆ ئیتر وا نەسووتێم

ببمە ڕەژوو

لەسەر سەرمۆ[2] تا تەوقی پێم

- ٤ -

کێ وەکو مۆ ئاشنای خەم و گریان بووە

دە پێم بڵێن :

کوا ئەوکەسەی؟

قاڵی ڕێژنە باران بووە!

تۆخوا . . . دایە دە بپرسە

کێ وەکو من تۆی خۆش ئەوێت

ئەی ئەو گیانەی

دەردی دووریت لە من کەوێت

١ ـ شیعرێکی فۆلکلۆری کوردییە .

٢ ـ سەرمۆ: سەرمەوە بۆپێویستی شیعر کورت کراوەتەوە .

# پەشیمانەکا نازڤریتن

■ عمر محمد عامر■

ل دەمێ چوی
وەختەك بورى
جیهان هەمی ببو لەیلان
نە دەر یا مان
نە زوزان مان
نە چیاو دول و نهال مان
نە کەڤرو دارو دارستان
ل سەر ئاخا سلێمان مان
سال دابوریت
هێشتا دلو
روژا ل ئاسمانێ دگەریت
چ جارا پەر نەداد هێلان
شەڤ رەڤی بوو
ژڤێ جیهانێ
جهـ و شینوار
لێ نە مابون
ب ئەڤی حالی
مروڤ د ژیان
ئەها هوسا
ئو ل ڤی دەمی
دلبەرا من
سەرێ خو ل جیهانێ هەلاند
ل چار کنارێت
خو زڤری
لێ دنێریت
جیهان هەمی یا دکەت گری
هەوار دکەت
بو شەڤەکێ
لێ بیت میهڤان
ئان سیبەرەك
ژ بە ژنا وان را ببیت پەژان
ئو روژا ل هنداڤ سەرێ وان
پێ دکەت کەنی
یا خراب دبیت
ژ کەنیادا
پاشینگێ یاب چەپی د زڤریت
ئو دبێتە وان

هەتا دمرن
دێ کارێوە
گازێو هەوارو ڤیژی بیت
هەوە نەدیت
شەڤەك ژوەرا ببیت . . . میهڤان
ئان سیبەرەك
ژ بەژنا وەرا ببیت پەژان
هەر وێ گاڤێ
چاڤ رەشا من
کەرب و کین ژروژێ هەل گرتن
هەر دوو چاڤێت خوینێن زەلال
ژ جیهانێ را
کرن دەریا
رەشە پرچا خویا نازك
ژێرا کر شەڤ
هەردوو رویکێت سور قورمزی
کرن بوستان
هەمی رەنگێ داری لێدان
ئەنیا خو ژێرا کر زوزان
کوچەراتێ هێدی . . هێدی
زەش کونێت خوە
دناڤ دا ڤەدان
وەلێ چاوا کەتن خەوێ
ئێدی رابون وا ژبیر کر
وەلێ دلو
نازکێ ژی باوەر نەدکر
گشت مروڤێت ئەڤی چەرخی
هود مرینە
گەر سەر دانا ل خەوا شیرین
کارێ را بونێ وان نینە
ئەڤجا دلو ئەز دزانم
کو نازکا پەشیمانە
لێ یا کریو
ژ نەڤرو پێڤە
ل کریارا خو نازڤریتن
نازڤریتن





# بەختێ من

● بشير محمد علي ●
دهوك

فالكێ . . .
فالكڤانێ . .
دەستێت منن
بگرە
ل ناڤ دەستێت
خو باش دانێ
ها . . بگرە، بخوینە هانێ
تو درانێ
دكەلم . . دكەلم
ژكو ڤانێ
خوش . . خوش
دنالم
ژ دەر دێ
برینەكێ؟!
ئەڤجا
نەرم . . نەرم
بێ ترس
نەكەی شەرم

نە ئارینە
لمن ڤێ
ژانێ

●●●

دەمەك دریژ
وێ چاڤ
ل سەر چاڤێت من ستێراند
كەفتە
پێلەك تەخمینا
كەفتە
دەریا هزرا
ل ڤان گاڤێت
بترس و لەرزین
وێ بەرێ خو
لمن وەرگێرا
فالكێ
فالكڤانێ . .
تە چ خواند لفالكا ژیانێ
من باخیڤە

من باخێڤە . .
تە ترسە ژ ترسا دلمانێ،
نوی بەرێ خو
لمن وەرگێرا
بدلەك شكەستی
ئەڤ دەستە
وێ بەردان
هێدی . . هێدی
ژوی دەستی
روندك . . روندك
وەك رویباری
ژ چاڤا مە شیان

●●●

ل دارێ ئەڤێ دنێ
من هەبو
یارەك تنێ!
خوشیا دلێ من ژی
ئەو بو

كەیف و
شەهیانا من
ئەو بو
خەم رەڤینا من
هەر ئەو بو
هەر ئەو بو . .

●●●

ئەڤرو ئەو یار
ل من بو نەیار
بەخت رەشییا
من لێ
گەهشتی‌یە
پلا
كو دلبەرا
ل بەر دلا
باركەت و من
بهێلە
من بهێلە . .



# وەی لە عەشق و نامۆیی و چاوەکانی تۆ

**شیعری فاروق فتاح هەڵەبجەیی**

- ١ -

خۆی عەشق سەوزێکی تۆخە
جار جاریش زەرد، وەك گەردە لوول
خۆی دەنوێنێ . . !
هەندێ جاریش . .
کاڵەوەکوو چاوەکانت
وەی لە عەشق و . . . نامۆیی‌و . . چاوەکانی تۆ

- ٢ -

کچێ توخوا سوێندت ئەدەم
بەشنرۆی . . بەباڵتمبۆ
جارێکی تر خۆت مەدە دەست
شەپۆلی گریانی عەشق ﻫ،
سۆزی لاوەکی سەرەڕۆ
ئەگەر دەڕۆی . .
بێ دەنگە برۆ . .
بێ وەی برۆ
وەی لە عەشق و . . . نامۆیی‌و . . چاوەکانی تۆ . .

- ٣ -

کچێ ئاخر . .
زەوی سووتا،
لە هاڵاوی هەناسەی من . . هەناسەی تۆ
تۆ خۆت بۆ خۆت جیهانێکی،
پان و بەرین و سەربەخۆ
چۆن بەرگەی ئەم عەشقە دەگرم
منیش منێکی ڕەنجەڕۆ
پێم نەوتی عەشق سەد جۆر،
شێتێتی گرتوەتە خۆ . . !
وەی لە عەشق و . . . نامۆیی‌و . . . چاوەکانی تۆ

- ٤ -

هەموو شەوێ لەیادمدا . . . دەتوێتەوەو
وا هەست دەکەم:
دەبی بەمن . . دەبم بەتۆ
من نازانم تۆ وێنەی دووەمی منی
یامن هی تۆ . .
وەی لە عەشق و . . نامۆیی‌و . . چاوەکانی تۆ



# لاساری..!

● فؤاد صديق صابر ●

لەسەر ڕێگا لەدایك بووم
دایکم ژنێکی باڵا بوو
بە تەنها.. دوو چاوی زەقی پێوە مابوو
فرچکم برسیەتی بوو..
لاساری هاوڕێی ڕاستەقینەم
ز ریان پێخەفم
بۆنی داگیرسانی شقاتەش
سەرچۆپی زەماوەندێکی جەرگبڕی دەگێڕا...
هەڵمی بەفر و خوڕەی ئاو و...
ئەو تاوێرە گەورانەی دایکم لە ناویانا دایـنام
ئوقلانەی بوونیان بۆ لێ دەدام
ئەی لاساری... ئەی لاساری...
لاسارم
لاسار نەبام
لە دووکەڵی جغارەدا
بۆنی توتنێکی تیژم نەدەکرد
لە هەرێمی زگ گوشینا
هەستی نوێژم نەدەکرد
لەم ژیانە پڕ جەنجاڵەش
هەستی بوونی خۆم نەدەکرد..!!

ئەی لاساری...
لاسارم
بە دوای بوونی خۆم عەوداڵم

لاسارم
لاسار نەبم
وەك مرۆڵێکی ساویلکە
کەوی دەکرێم!
خێرا دەخورێم!
ئینجا
بۆ ناو تەنەکەی زبڵی فڕێ دەدرێم...!!

ئا.. ی.. ي...
مزگەوتەکان هێشتا قنجن!
لاسارەکانیش ئەنجن ئەنجن!!
ئەی.. لاساری... ی..
لاساری پیشەی منالیمە
ئێستاش هەر لە گەڵیمە
کەچی ورگنانی شار وا دەزانن
ئێستا یەکێکی دیمە!!

# بەشێکی تر لە دۆزەخ

• شاهۆ سعید •

- ١ -

لەم کونجە نسرم و تارە
نزایەکی ساردو لەرزۆك
لەنێوانی لێوەکانم دێتە دەرێ،
جارە جارەش...
تەرتیلێکی مات ئەچرم و
تەرتیلەکەش...
بەدەم هۆرەی گفە باوە
نزای مەرگم ئەلاوێنێ،
تا لەو جیهانە دەر ئەچم
درەختەکانی ژاڵەیەو
دەریای مردوو...
سروشتیش تیای... هێمایەکە بۆ دزێوی،
دەرئەچم و
پەنا بۆ ئەودیو بوون ئەبەم
گەشتی نێوان... ئەستێران و ئاسمان ئەکەم،
لەپڕ تاودا... هەنسکێك و
چریکەیەك لە ناخەوە
باڵی فرین ئەپچرێنێ،
تەرتیلیشم لێ ئەکاتە... کوراڵی دێو،
چونکە هەوای ئەم دۆزەخە
بەرگەی تەرتیل ناگرێ.

- ٢ -

هەرچەند رامبو[١]... بەکات و شوێن
لەمن دوورە
دووری دوو سەدەو کیشوەرێك،
بەڵام گڕی دۆزەخەکەی[٢]
هەموو شەوێك
لە ناو پێتی ئەم کتێبەی نێوان دەستم
دێتە دەرێو کڵپە ئەدا!...
کونجەکەشم، بە کونجێکی قووڵ و تەنگی
دۆزەخ ئەکا،...

- ٣ -

هەموو شەوێك
لوورەی زریانێکی تەزیو
لە گەڵ قاژەی
قەلەرەشی حەسرەت و شووم
در بە ناڵەو لەرە لەری
پەنجەرەی ژوورەکەم ئەدا،
منیش وەك پەیکەرێکی سر
چاوەکانم وەنەوز نابا،
نە ئەوێرم بۆتارێکی پشت پەنجەرەو
لاژەی مەرگی باڵندەکان، سەر هەڵبڕم،

نه ئەشوێرم. . .
بۆ خوێندنەوەی بەشێکی تر
لە دۆزەخی رەشی رامبۆ
کەللەی سەری تاسێنراوم، دانەوێنم!.

- ٤ -
هەموو شەوێك شەیتان دێت و
لە ناکاودا. .
خۆی ئەکا بە ژوورەکەمدا
تا ئەمکاتە سیاڵێك و لە بەرم ئەکا،
لە بەرم ئەکاو
کۆڵانەکانی دۆزەخم پیشان ئەدا
بەسەر پردێکی بڵندا
ئەمبا بەسەر ئەو جیهانەی
مرۆڤەکان تارمایین و
درەختەکان ژەهراوین ودەریاکانیش زووخاو کێشن،
لە دواییدا. . .
لە ناو چەقی ئاگرەوە
شاشەیەکی لێڵ ئەبینم
لە ناویدا. . . کونج بەکونجی
نەوەکانم بەدی ئەکەم،
لە پاش ئیستێك. . . . شەیتان ئەرواو
چارە نووسی یەك یەکیانم ئەخاتە مشت.

- ٥ -
لە شەوێکدا. . . لەو شەوە پرچ ژەهراویانە
لە دوای زرمەو تیشکانی پەنجەرەکەم،
شەیتان هات و
لەگەڵ قەلەرەش و زریان
خزانە ناو ژوورەکەوە،
لەگەڵ هەنگاوی شەیتاناو. . .
باڵەفرەی قەلەرەش و. . . لوورەی زریان
کۆراڵێکی بێ رەنگە، سامناك
لە بنمیچی ژوورەکەوە
چریکانی و بانگی کردم:

تۆ فەهێلی[٣] و. . .
بە فەهێلی لە دایك بوویت،
پێش ئەوەی بێی، بە چەند ساتێك
کاروانەکە بەجێی هێشتی
تۆی لەم گۆرە نسرمەدا. . .
لەناو چەقی. . . تاریکستانی دزێوا، ماڵئاوا کرد
جێگات دۆزەخ،
شەیتان رۆحت،
پەلەووره شومەکانیش. . .
هاورێی مەرگت،
گلەو لوورەش
لاواندنە بەسۆزەکەی. . . سەرەمەرگت.

- ٦ -
مرۆڤێکم، رەش بین نیم من،
هەرگیز عاشق بە تاریکیو نووتەك نەبووم،
هەرگیز ئاشنای ئەوە نەبووم
ئەم کونجە تەسکە ببێتە
مەنزڵی تا هەتاییم و
شوێنی مەرگم،
مرۆڤێکم. . . حەز بە گۆرانیەك ئەکەم
لە دەریاکانەوە هەڵکا،
ئاشنای خەندەی، راکردنی
بەر بارانی پایزانم،
ئاشنای دەس نانە ژێر چەنەی
رووەو کەلی ئێوارانم،
وەلێ ئەفسوس. . .
چاووم شنە لێڵ ئەبینێ،
چاووم ئاسمان سوور ئەبینێ،
تنۆکەکانی بارانیش. . .
وەکوو دڵۆپە قورقوشم!
وەلێ ئەفسوس. . . وەلێ ئەفسوس.

١ ـ رامبۆ: ئارثەر رامبۆ، شاعیری فەرەنسی مەزن [١٨٥٤ ـ ١٨٩١ز].
٢ ـ دۆزەکەی رامبۆ: مەبەست بە دیوانە شیعرییەکەیەتی [فصل في الجحيم].
٣ ـ فەهێل: بەجێ ماو.

# گوڵ وەریا

● ئازاد عبدالرحمن حسین ●





ئەگەر گول بو من قەد نە یشکوریتن
ما بوچی لناڤ باخێ خو دکەم قەیدار
ئەگەر کەوێ روباد یو من نەقەبتن
ما دێ بوچی رکەهی یو کەمە وار
ئەگەر هنگڤین لسەر ئەزمانی بو تەعلەریل
شرین ترە ژوی هنگڤینی ژەهرەمار
ئەگەر نیرگزێ بێها خو ڤەدزی
خوناڤا خو ڤەشارت و مایێ خەمل وکار
دێ هلکێشم ژڤافکێ حەودکا رمزی
یلابچت ناحەوینت چول و بەیار
ئەگەر چاڤێت پەریێ بون گولێت چریك
یایێ تامە هەژاندنا یرینێت خار
ئەگەر دو لێڤێت نارینا من چرمسین
چەندا تەعلە گرنژینا بەفرا سار
ئەگەر دێمێ نازك شرین یو گولەك رەش
چاڤان گوتی لتە پیروزیت پێچە و هیشار
ئەگەر مەرجانکێت وی دەڤی یونە مشار
نەخو نانی لتە حەلالیت گوشتێ مرار
ئەگەر شەمام نەرم و رزین بینیڤە
نە ئەز ناکەم خێڤە لسەر نەکە بازار
ئەگەر دلێ یو کەڤرەکێ وەك پیلای
من نەخەمە یو من نەبت چ گوند و شار
ئەگەر خەزالێ نەڤێتن بم نێچیرڤان
ما دێ یوچی لدیف بەزم و کەمە غار
ئەگەر گەزی یونە وەریسێ سێ پیکێ
من ئازاکە ناهێن کوشتن چ ئەڤیندار

---

# ژیان





خۆشەویستم
خۆشەویستیت شەوێکی
بێ مانگ و ئەستێرە بوو
تاکە گوڵێك بوو لەدەمەوپایزا
لەگرمەی هەور نەئەترسا .

مەلەوانی
دەریایەکی پڕ درندە بوو
بەڵێ ئازیزەکەم
خۆشەویستیت
درکەکانی کێڵگەی دڵمی
دائەپچڕی

بەڵام ژیان
ئەی چاندەوە . . ئەی چاندەوە
ئاگرێك بوو
هەموو جارێ ئەیسوتاندم
لەهەمان کاتدا
بووبوو بە مەشخەڵی
ژوورە تاریکەکەی ژیانم

● پەخشان طالب ●

# جوکەك ژ ئەڤرێژا بێناری حەیرانوکا

- جميل محمد شيلازي -

بی‌کـومـان حەیـرانـوّك ژ ی لگەل ستراني پەيدا بويە ئانكو ژچـاخـی پەیـدا بونـا ژ ینـا تەڤـایی‌ڤە ئەوژ ی پەیدا بویە، وئەو پەیڤین کیم و بیانی کو دناڤدانن ئەوژ ی وەك هەمی بابەتین مە ئین کەڤن پشتی هاتنا ئیسلامی بەرە بەرە هاتنە دناڤداوو وجهین خوکرتنە، ئان ئەوژ ی ژ ئین پشتی هاتنا ئیسلامی‌نە.

یەك ژ جورین ڤی ئاوایی هویی ڕنـدوسپـەهی، سترانین ئەڤینـدارانـە، حەیـرانانە، دل ب کولانە. . . چاخی ئەڤینی‌و دلـداری، دەرکەهی دلین وان دقوتیت و لی دبیت میهڤان. پرچ و برهـ . . . لیـڤ وددان . . ڕی‌وچاڤ. . . سینـــك و بەروبەدەن . . بەژ ن وبال . . دەست وتبك . . خوهەژاندن و فشاندن . . . سمیبل و ریهـ . . . شەل و شەپك . . . چوخ و بەرگیــز . . . کالــك وساڤ وکورە . . . لەوەنـــدی‌و کولاڤ و دەرسوك . . . دەمی چاڤی کورو کچا ب ئیك ودوودکەڤیت، شەوقـا ئەڤینـا ئشقـا شویکـدن وژ ن ئینـانـا وان، ژ سوتنی‌و کوزرین و ڤرڤچینا دلی وان، نەچار دکرن، جارژ کەیڤا جارژ خەمـا، ئەڤ چەنـدە بوخودکـرنـە دەست پیکـدنـا ڤەهـاندنا حەیـرانـوکـا ب ئي دوودکـوتن، ئەڤینی‌و دلکی ئیك ودووپی خویا دکرن، ڕوژ یت خوب دلخوشی پی دبوراندن.

پیـدڤی گوتن ئەوە وەچکـو ئەم هەمی دزانین کوباهـرا پترژ حەیـرانــوکــا کچی یین ڤەهـانـدین و ڤەکیـراین، لی نەڤـە مهانەنینە، گەلە جارا کوکی ژ ی یین پی کوتین ئانژ ی یین لی ڤەگیـراین . . گەلـە جاراژ ی مهانە نەبویە کو هەردو نەڤین دارا چاڤین وان ڤیك کەفتبان لی دهاتنە هنارتن د ریکا مروڤەکی‌را دنیڤا حەیرانوکادا دا دی بن دەستیا ژنی یی بەلی‌یەو کیم جارا یا شیای ژ بن ڤی باری دەرکەڤیت و بکەهیتە ڤیانا خو. . .

ئەکەر دەمی ئەم ڤان حەیرانوکا ژ دەمی نیکی وەرکرین، ل دویڤ بچین و بیـژ ینی : ـ ئەڤ حەیرانوکە کی کوتەو بوچی؟؟ ئانکـو سەرهـاتیـا وی بومەبیژە، ئە دشیم بیژم سی پشکا وان دی سەروکـانیت وان یيت بنیاتی (المصـادر الاساسية) بومە خویـاین . . ئەڤ چەنــد حەیــرانــوکیت دڤی کوتــاری‌دا، سەروکـانیت بنیـاتی ، بومن هاتینە کوتن ومن نڤیسینە، پیترژ خودانیت وان هیشتـا دسـاخن نەمـرنـە . . بەلی ژ بەر چەنـد ئەگـەرەکیت چڤـاکی ئەز نەشیـام سەرهاتییت وان بنڤیسم. . هەکـە ڤیکـاڤی مروڤ سەرهاتیا حەیرانوکەکی بنڤیسیت بیژت فلان کەسی یان فلان کەسی گوتی‌یـە، دی ئەوبخـوهەکـە یا ساخ بیت، هەکە یا ساخ نەبیت، مروڤیت وی ئان (وی) دی خونەڕازی کەن، ئەووەدگـرن، تشتـەك کیسماسیە بووان. .، ڤیجــار هیڤیـدارم ڕوژەك بهیت، ئەم بشین سەروکـانیت وان

بیت بنیاتی دانین پیش چاقیت خواندەفانا.
مب دویماهی ئەزفان چەند حەیرانوکا ژ فیزوکەنجیت مەو ئەقیندارا ڕا دکەم دیاریو بو هەر خواندەفانەکی، شەیدایی حەیرانوکاو. . . هیفیدارم بهینە بەلاڤکرن دا کو بەرزە نەبن، سوپاس. مهو دکەل حەیرانوکا: ـ

ـ ۱ ـ

**چومە نزاری. . نزاری تاری**
**گەڤوتی شوین دکەت،**
**ناڤ دارو باری**
**حەیرانی رەشە،**
**دی بەم سەر صەفاری**

ـ ۲ ـ

**چومە ناڤ چەما. . . ناڤ چەمەکی**
**دوو گول شوینبون،**
**ل ناڤ باغەکی**
**خوزیکیت وی ڕوژی، دوو**
**سەر دچن سەر بالگهەکی**

ـ ۳ ـ

**چومە ناڤ چەما. . چەم دهینن**
**چومە کولا. . . کول زەیتینن**
**هەچییی یارکەك دگوندی**
**خودا نەبت، سەر یار نینن**

ـ ٤ ـ

**ئەڤ شەڤ شەڤە،**
**شەڤ هنگورە**
**دەری ڤەکە. . وەرە ژورە**
**دەیکا کەرە. . بابی کورە**

ـ ٥ ـ

**ئیڤارە ئیڤارا خیرا**
**مەلا چونە مزگەفتی. .**
**قەشە چونە کاڤلە دیدا**
**کچکا بچویك بو. .**
**کەتە بەر خەمیت مال و میرا**

ـ ٦ ـ

**کەلی لبەر کەلی**
**باکەکی هاتو دلی من کەلی**
**دی بلا ئەز هنکوستیرەك بامە**
**د تبلا کوری مەلا عەلی**

ـ ۷ ـ

**مایی لبەر مایی**
**قودیکا خو بەرزەکر،**
**لسەر بانی تەکیایی**
**من د ڤیتو. .**
**نورییی کوری ئامینایی**

ـ ۸ ـ

**ئەڤی عەوری. . ورتی. . ورتی**
**ڤی میرگشکا خوناڤ کرتی**
**من خلامی. . . دەستی ئیسماعیلی**
**هەکە ل مەدرەسا مایی،**
**قەلەم گرتی**

ـ ۹ ـ

**ئەڤی عەوری. . پنی. . . پنی**
**دەری خانییی مە سەکنی**
**کورکو دینو. . ئەز چ بکەعم؟!**
**ئەزا بمیرم. . . تویی ب ژنی**

ـ ۱۰ ـ

**عەوری ڕەشی گەمورە**
**تو د کولانی هەلبورە**
**تو دەرمانی چاڤیت کورە**

ـ ۱۱ ـ

**چومە کانیکا گوندیمە**
**ب سرکە**
**ئاڤاڤیدا تیتە خاری چپك. . چپکە**
**هەچییی حەیرانی کالی**

به بیاسیت
سمبیل زەرە . . هیشتا کورکە

- ١٢ -

کەفشیکیت بەفری . . پەمن سینە
هەلاد و بەیبین . . ناشفیت بەفرینە
شاهدیت من و لاوکی دەلاد
[مەلا نیکەنیت] حودێ بە

- ١٣ -

چ کانیکا رەحی حیزی
بەرکەک هافیت بەر فریری
ترمانجە . بەلی نەر نادەم . . .
ب نیکی (بەلکانیز) ی

- ١٤ -

کورکو دینو -
بە شەب سینو . . شەب مەزەزو
دەری نی حانی‌یی بابی مندا .
وەزە . . هەزە . . ب نەزو بەزو
هەکە نو بی بیچیرەبی .
حەزاب نەزو

- ١٥ -

هەبی (سیلاز) نوبدی مەرد
سەردا جویە . . ۀ دبندا رەرد
دوست لاوکی حوهەر نەرم
هەبی (شیلازا) یا ب کەفرە
سەزد جویە . . دبندا پرە
نامی لاوکی من صاهرە

- ١٦ -

هەری جویبارو . . جویباری جویی
بەیبرە شکەستا . . هەفجاری سویی
پ نیریری . . من چەندی ب نە دویی

- ١٧ -

نیقارە . . نیقاری د بەلاقن
رستکیت مەرجانا بەعدابی د ناقن
بیت کچکا کەفن . . .
بیت کورکا سلافن

- ١٨ -

هەری حەجیجی مانو یا دینی؟
تو مامی (شیخ مطهر) تی نابینی
یاتە نشفە . . یا من نەقینی

- ١٩ -

چەلی مابی چەند بندا
سەر جحوینا کەتە دبندا
خەچ رەریل بو کەتە کوندا

- ٢٠ -

حمەیراد خویشکا طاهری
سەر جحوینا فتنە کری
(نیشانلا) دی بی[نەهەبی] ناکری

- ٢١ -

رەرکی د بەنەنی . . رەرکی د بەنەنی
رریوکا ریقی . . خالا د کەردەنی
دایکی من د فیتو . .
بابکو من بدەنیء

- ٢٢ -

کچکی دینی :
فیستاد سوری بادن هەوا
تە دپاخلی‌هیکیت کەوا
بە نەر سویم ب فاد درەوا

- ٢٣ -

ریکا رەزا ب خدو خیزە
کراسی حەلی فەناویزە
هانە حەنی . . حەلا ریزە

- ٢٤ -

نەف شەف شەفە . .
شەف بارانە
کەرا دانا رەح مالانە

هەکە حەفیا خودیيە
شیڤا شڤقانی سەر یارانە

- ٢٥ -

کچکی دینی:
بەژنا تە ڤانینە .. خوش ڤانینە
رویتیت شالی شوربوینە،
سەر ڤیستانی ڤەدیمەیدا
[مشتەرییت] بەژنا بلند ...
ناڤ تەنک زراڤ ...
بی ب [مەزادی] [ لیک رابینە]

- ٢٦ -

چ خانیکی بەرسنگ سەرڤە
خودی کولا حەلەبی .. بیحیتە مالا
دەرو جیرانا،
کەس نەچیتە ژ دەرڤە
وەنەکر نەچیتە ژ دەرڤە
وەنەکر نەرو بەژنا بلند ..
ناڤ نەنک زراڤ،
ژ نیڤا شەڤ پیڤە،
بچینە بەریك ڤە.

- ٢٧ -

کورکو دینو:
وەرە مالا بابی من نڤیژکە
ڤەلوینی تیکە .. باسکی دریژکە
هەکە بابی من و دەیکا من کوت: ..
نەو کییە هاتی؟
دی بیژمی:
حلامی میدی بی هاتی درانی پیشکەت

- ٢٨ -

کورکو دینو:
وەرە مالا بابی من بجارەکی
نەر دی بونە لینم ساقارەکی
دی کەمی .. ڤەبیىو رویتیت پاییزەکی

- ٢٩ -

مالکا خو مەدەیناپو، ما بەینا
هەر دوو کرا
خودی حرابکەت، هەرسی
مالیت مهاجدا
وەنەکر نەرو محبەتا دەلال،
کەڤینە سەر بالکیکی ب دەیئا دلا

- ٣٠ -

بەژنا بلند بلندیا
یا د هەژینیت نەوەندیا
من نەزانی کاحەیرانی،
منی مالی بو ... ناڤ تەڤەندیا

**زیدەرو دەهمەل . -**

١ - [illegible] صبری بوتانی. بپ ٩.
٢ - [illegible] (١١١). [illegible] بپ ٨٥.
٣ - زیدەری نیکی. (ئیرەك پیدەی) ب [illegible] بپ ٦
٤ - [illegible] بپ ٢٢ [illegible] (١)، [illegible]
٥ - [illegible]
٦ - [illegible] بپ ٣٤ [illegible] (٤٣)، [illegible]
٧ - [illegible] (١٠١، ١٩، ٣٠) [illegible]
[illegible]
٨ - [illegible]
٩ - [illegible] بپ ٣٦ [illegible] (٦٠)، [illegible]

**تیبینی: -**

[illegible]
١ - [illegible] (٩٠) [illegible]
٢ - [illegible] (٥٧) [illegible]
٣ - [illegible] (٤٩) [illegible]
[illegible] ٢٠ - ٣ - ١٩٨٧.
[illegible]

# شاعیرو نووسەری مالیزی
# عوسمان اوانج

نووسینی

● فوزي عبدالمجید ●



ئەم شاعیرە بە میری شاعیرانی مالیزیا دەژمێررێ. خەلاتی ئەدەبی و شیعری ولاتانی خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیای پێدراوە. هەروەها رۆمانی «تولینج پرشنکا»ی ئەم نووسەرە خەلاتی ریزلێنانی مالیزیای بۆ سالی ١٩٧٢ پێدرا.

لە ١٢ تەمموزی سالی ١٩٢٩ لە دایك بووە سالی ١٩٣٦ چووەتە قوتابخانەو سالی ١٩٤٠ قوناغی ئامادەیی تەواو کردووە. بەلام بەهۆی داگیرکردنی یابان کە مالیزیای داگیرکرد ناچار بوو زانکو بەجێ بهێنێ دواجا بۆ ماوەیەك بووەتە دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی [منافون مالیزیا] تا سالی ١٩٦٢ کاری رۆژنامەنووسی کردووە..

لە سالی [١٩٤٨] ەوە رووی لە ئەدەب کردووە ئێستا بە دامەزرێنەری جولانەوەی ئەدەبی و شیعری مالیزی دەژمێررێ.. تا ئێستا [١٨] کتێبی وەبەرهەم هێناوە.. گەلێ لە کتێبەکانی بۆ زمانی تر وەرگێراون لەوانە زمانی اسپانی و

فرەنسی و ئەلمانی و روسی . . . رۆمانی [تولینج یرشنکا] ئازاری نامۆیی و غوربەتی خۆی تیا دەربڕیوە، لە پەنای ئەوەشەوە داوای سەربەستی دەکات . . . هەروەها گەلێ چیرۆکی کورتی نووسیوەو لە بواری شانۆدا تا ئێستا سێ شانۆنامەی خراو نەتە سەرشانۆو جێگای ڕەزامەندی بینەران و ڕەخنەگران بوون .

زانکۆی اوکسفورد گەلێ شیعری ئەم شاعیرەی بۆ ئینگلیزی وەرگێڕاو تا ئێستا حەوت جار چاپ کراوەتەوە . بێجگە لەم دیوانە شیعری یەی چەند کۆمەڵە چیرۆکیکیش بە چاپ گەیاندووە «کوالالامبور ۱۹۵۹ ] [خولخواردنی کات ۱۹٦٥ ] و [موسیقای اودیدان ۹۷٦] گەلیکی تر.

لە نووسینەکانیا بۆنی سەربەستی ئازادی دەکەین و دەمیکە پشتگیری خەباتی ڕەوای گەلی فەلەستین دەکات چەند جارێکیش هێرشی بردۆتە سەر زایۆنیزم لە ئەنجامی ئەو تاوانانەی کە لە لوبنان بەرپای کردووە . چەند جارێکیش کەوتۆتە پێش مالیزی یەکان و بەشداری ئەو خۆپیشاندانەی کردووە کە پشتگیری لە هاوولاتیانی فەلەستینی دەکات . هەروەها پشتگیری جەنگی ڕەوای عێراقی کردووە دژی خومەینی یەکان .

لەگەڵ دوو ئەدیبی ناسراوی تردا کتێبێکیان چاپ کردووە لەژێر ناوی Manifestasi] کە هەرەشە لە تاوانەکانی زایۆنیزمەکان دەکات و پشتگیری لوبنان دەکات .

**ئەمەش پارچەیەکە لە شیعرێکی ئەم شاعیرە**

**بە یاساکانیان تالانمان دەکەن**
**گوللەوفیشەك بە دولار دەپێچن و بۆسنگمان**
**دەیهاوێژن .**
**دەبێ ئێمەش یەکێکیان هەڵبژێرین**
**یا دولار یا فیشەك .**
**هیچ چارەیەکی تر نی یە**

●●●

**هاوڕێکانم فیشەك و گوللەتۆپیان هەڵبژارد**
**سەرکردەکانیش دولار**
**بۆیە جلەکانتان خەڵتانی خوێنە**
**درك بهارن . بەرد بگوشن**
**بۆ خواردن و خواردنەوە .**
**کاتێ کچان ناریجۆك دەهاوێژن**
**منالان فیشەك ئامادە دەکەن**
**ئێوەش هاوریان ئاسۆتان خەملاند**
**قوژبنی زیندانەکانتان پر لە ئومید کردو**
**گۆرانی بۆ فەلەستین دەڵێن .**

●●●

**لەگەل شریخەی تفەنگێکی فەلەستینی**
**هەزار دەنگ ، دەنگ دەداتەوە**
**زامی فەلەستینیش**
**بیابانەکان دەشواتەوە**

●●●

**ئالاکەمان دەشنێتەوە**
**بەسەر هەموو جیهانا دەشنێتەوە .**
**کوڵمەدە . . بروخێنە**
**جارێکی تر تێ هەڵچۆ . . . جارێکی تر بابروخێ**
**سەرکەوتن بۆ خەباتە**
**ئەمە چارەنووسی گەلەو**
**سەلاوی سەرکەوتنیش بۆ منالانی فەلەستین**

ئەمساڵ ئەم شاعیرە ئازادیخوازە لە میهرەجانی مربد ئامادە بوو . . . سەردانی فاوی کرد چووە شاری شاران کە بەرێم دەخست بەڵێنی دا شیعرێك بۆ شەهیدانی جەنگی ڕەوامان بنووسێ و جوانی [بصره] ش بە شیعر دەربڕێ . کە دەدوا هەندێ داوو دەرمان بە دەستی یەوە بوو چونکی نەخۆشی دلێ هەیە . . چاوەکانی ئاویان تیا زا . . . ئەم شاعیرە هاوڕێ یەکی دلسۆزی عێراقی یەکانە : «هەرگیز بەغداو سەرۆك صدام و عێراقی یەکان لەبیر ناکەم» .

کتێبێکم بەدەستەوەیە بە وتەیەکی سەرۆك صدام دەستی پێ دەکەم کە دەڵێ «ولاتێك هونەرمەندی گەورەی تیادا نەبێ پیاوی سیاسی گەورەی تیا هەڵناکەوێ]

# ڕۆژنامەنووسی شەرەف وقوربانی دانە

● شێرزاد عبدالرحمن●

که دەڵێین ڕۆژنامە نووسی شەرەفە، دەمانەوێ ئەوە بسەلمێنین، کە شتێ نی‌یە، لە ووشە پیرۆزتر بێت. ووشەی ڕاستگۆ ووشەی هەق. ووشەی خێرخواز ئەو ووشەیەی کە پێناسەی ڕۆژنامە نووسەو بەهۆیەوە لەڕووی هەموودیاردەو ڕوواڵەتە تاڵەکان دەجەنگێ و بەرگری لەڕاستی و هەموو مەسەلە پیرۆزەکانی تری مرۆڤ دەکات..

ئەوانەی بە پیرۆزی مامەڵە لەگەڵ ئەو ووشەیەدا دەکەن، ڕەسەنایەتی و ڕەوشتی و باڵای خۆیان نیشان دەدەن پەیامێکی گەورەی مرۆڤایەتی بەکۆمەڵەکەیان دەگەیەنن. پەیامێك کە دەبێتە زمانی ڕاستەقینەی گەل و ئاوێنەی بێ گەردی ڕەنگ دانەوەی ئاواتەکانیان. بەپاراستنی ئەم شەرەفە گەورەیە ڕۆژنامەنووس دەبێتە پارچەیەکی زیندووی گەل. ئەو ڕۆژنامەنووسەی بە پیرۆزیەوە قەڵەمەکەی بۆ بەرژەوەندی و ئاواتی گەلەکەی بەکار دەهێنێ چ جیاوازیەکی نی‌یە لەگەڵ ئەوجەنگاوەرەی کە تفەنگەکەی بۆ بەرگری کردن لە خاك بەکار دەهێنێ. چونکە هەر دووکیان شەرەفی بەرگری کردن لەڕاستی‌یان پێ سپێردراوە...

ڕۆژنامەنووس کاتێك بە دڵنیایەوە دەبێتە دەنگی ڕاستەقینەی ڕاستی. کاتێ بڕوا بەکۆمەڵەکەی بیەخشێ و تواناى ئەوەی هەبێت ئەو بڕوا پیرۆزە بپارێزێ. نەك ئەم بڕوایە وەك هەر کەرەستەیەکی بازاڕی بەکار بێنێ و لە خزمەتی بەرژەوەندی یە تایبەتیەکانی خۆی دابنێ. لای‌نەدا.

لە پێناوی هەر مەسەلەیەك دا کە پیرۆزی ووشە بزرنگێنێ و خزمەتی ئامانجی ڕاستەقینەی گەلی نەکرد. کەشەرەفی ڕۆژنامەنووسی دەدۆڕێنێ و دەبێتە بازرگان.

کۆمەڵ هەمیشە چاوی لەوەیە کە ڕۆژنامەنووس. ببێتە پێشەنگ و [illegible] بۆ دەربڕینی ئاوات و خواستەکانیان بخاتە سەرپشت [illegible] مرۆڤێکی داهێنەرو پیرۆزە بەدووای ڕاستیدا دەگەڕێ. [illegible] ڕۆژنامەنووس بەچاوێکی گەورەتر تەماشا دەکرێت لە کەسێکی تر ئاسایی زیاتر.

قوربانی دانیش ئەوەیە کە مرۆڤ توانایێك یان بەخشێك بیەخشێ لەو ڕاددەیە گەورەتر بێت کەبۆی داندراوە.

ڕۆژنامە نووسیش قوربانی بە هەموو ووزەو توانایێکی خۆی دەدات لەپێناو گەیاندنی ئەو پەیامە پیرۆزەی کە هەڵی دەگرێ ئینجا ئەم قوربانی دانە بەهەر نرخێك بێت و لەسەر حیسابی هەر شتێك بێت چونکە مەسەلەی هەرە گەورە لەلای ڕۆژنامەنووس ئەوەیە کە بەدەست پاکی و بەگیانێکی پاراو بەتوانایێکی پڕ لەداهێنانەوە بتوانێ ئامانجی خۆی بپێکێ. ئەگەر چی لەم ڕێگە پیرۆزەش دا دووچاری ماندووبوون و شل وشەکەتی بێت، هەتا ئەگەر گەیاندنی ئەم ئامانجە لەسەر حیسابی هەمووژیانیشی بێت هەر شتێکی ئاسایی‌یە ئێمە نموونەمان زۆرە لەسەر ئەو ڕۆژنامەنووسە بە جەرگانەی کە قوربانیان بەهەموو شتێك دەدا لەپێناوی گەیاندنی ووشەی پیرۆزی کوردی لەوانە پیرەمێردی نەمرو حوزنی گەورەو مامۆستا سەجادی وهی‌تریش...

ئەوانەی کە هەڵگری پەیامی گەورەن. هەمیشە شتی خەیاڵی دروست دەکەن، لەوشتانە کە لە توانای تاقە مرۆڤێك بە دەرە! بۆیە دەبن بە داهێنەرو گەورەو نەمر. چونکە ئەوانە دەبوون بەهەموو شتێك، تەنیا نەدەبوونە قورقوشم و پێ، چونکە بە ئامانجێکی گەورەوە خزمەتیان دەکرد. هەموو ئاسو دەییەکیشیان لە گەشانەوەی چاوی خەڵکی و لە ڕووناك کردنەوەی بیری کۆمەڵەکەیان دا بووە. ئەمەیە ئامانجی پیرۆزی ڕۆژنامە نووسی، بۆیە ڕاستە ڕۆژنامەنووسی شەرەف و قوربانی‌دانە.

*

ووتەیەکی سەرۆکی فەرماندەیە

دەربارەی ڕۆژنامە نووسی.

